# مامۆستا
# شێخ محەممەدی خاڵ

## لە کۆمەڵە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسییدا

د. ئاراس محەممەد ساڵح



لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری
زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٣٤)




مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ
لە کۆمەڵە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسییدا
د. ئاراس محەممەد ساڵح

ئەم دیمانانە بۆ ئاشنابوونە بە دیدوبۆچوون و تێزەکانی شێخ محەممەدی خاڵ، لەگەڵ کەسانێك ئەنجامدراون کە لە سەردەمی شێخی خاڵدا ژیاون و ئاگاداری پرۆژە ئیسلاحییەکەی بوون، هەروەها لەگەڵ کەسانێکی دیکە کە لە دوای ئەو سەردەمە هاتوون، بەڵام خوێندنەوەیان هەبووە بۆ نووسین و بۆچوونەکانی، مەرج نییە نووسەر لەگەڵ هەموو بۆچوونەکاندا هاوڕابێت.



# مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ
# لە کۆمەڵە دیدارێکی ڕۆژنامەنووسییدا

**لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

**(٣٤)**


- ئامادەکردنی: د. ئاراس محەمەد ساڵح
- بابەت: دیمانە
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ڕەوشت محەمەد
- تیراژ: ٥٠٠ دانة
- چاپخانە: سەردەم ٢٠١٥
- نۆبەی چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەگشتییەکان

ژمارە (١٧٣١)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

# ناوەڕۆکی ئەم کتێبە

# تێبینییەکی پێویست

ئەم دیمانانە بۆ ئاشنابوونە بە دیدوبۆچوونو تێزەکانی شێخ محەممەدی خاڵ، لەگەڵ کەسانێك ئەنجامدراون کە لە سەردەمی شێخی خاڵدا ژیاونو ئاگاداری پڕۆژە ئیسلاحییەکەی بوون، هەروەها لەگەڵ کەسانێکی دیکە کە لە دوای ئەو سەردەمە هاتوون، بەڵام خوێندنەوەیان هەبووە بۆ نووسینو بۆچوونەکانی، بەڵام مەرج نییە نووسەر لەگەڵ هەموو بۆچوونەکاندا هاوڕابێت، هاوکات زۆر بە ئەمانەتەوە بۆچوونی ئەو کەسانەی تۆمار کردووە کە دیمانەی لەگەڵ کردوون، لەهەمانکاتدا سوپاسو پێزانینی هەیە بۆ هەموو ئەوانەی ماندووبوونو بەدەم داواکارییەکەیەوە هاتوونو هاوکاری بوون.

# پێشەکی

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم کۆمەڵێك گۆڕانی گەورە روو لە جیهانی ئیسلامی دەکاتو کوردستانیش لەو گۆڕانانە دواناکەوێتو لەگەڵ شەپۆلی گۆڕانکاریو پێشهاتەکاندا هەنگاو دەنێت، ئەگەو ئەو هەنگاونانە هێواشو لەسەرخۆیش بووبێت، لەو گۆڕانانە هاتنی داگیرکاری رۆژئاوایی بۆ جیهانی ئیسلامیو گەیشتنی سەرەتاکانی شارستانییەتی ئەوروپا بۆ رۆژهەڵاتو دەرکەوتنی بزاڤی رۆژنامەنووسییو چاپخانە و دەرکەوتنی بیری نوێو دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەییو هەڵوەشاندنەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەهەمانکاتدا دەرکەوتنی قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی بە ڕابەرایەتی سەید جەمالەددینی ئەفغانی (١٨٣٨-١٨٩٧ز) و (شێخ محەممەد عەبدە ١٨٤٩-١٩٠٥ز) و هاوڕێکانیان.

دەرکەوتنی قوتابخانەی ئیسلاحی ئیسلامیی تەواو گۆمی مەنگی جیهانی ئیسلامیی شڵەقاند و جوڵە و وریابوونەوەیەکی گەورەی خستە نێوەندە ئایینییەکە و داوای بێداری ئیسلامییو کردنەوەی دەرگای ئیجیتیهاد و نوێبوونەوەی بیری ئیسلامیی دەکرد، لەو کاتو سەردەمەدا کە جیهانی ئیسلامیی کەوتبووە بەردەم پێشهاتەکانی شارستانییەتی ئەوروپا و

لەهەمانکاتدا داگیرکاری سەربازیی ئیستیعماری نویێ، ئا لەو کاتو رۆژگارەدا قوتابخانەی ریفۆرمی ئایینی دەوری کارا و کاریگەری لە هۆشیارکردنەوەی زانایانی موسڵمانو موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی بینی.

قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامیی لە رێگەی رۆژنامە و گۆڤارەوە بەتایبەتی (العروة الوثقی ١٨٨٤ز) توانی دەنگی خۆی بگەیەنێتە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیو هۆشارییەکی ئیسلامیی گەورەی خستە نێو نێوەندە ئایینییە تەقلیدییەکە و نێو زانایانی موسڵمانەوە، بەتایبەتی لە شوێنێکی وەك قاهیرەو زانکۆی ئەزهەر کە سەدان زانای گەورەو هەزاران قوتابی لەهەموو وڵاتانی جیهانەوە روویان لەو زانکۆیە دەکرد، ئەو نێوەندە زانستییە گرنگە رۆڵو کاریگەریی زۆری لە بڵاوکردنەوەو گەیاندنی بیری نوێی ئەو قوتابخانە ئیسڵاحییە بە هەموو جیهانی ئیسلامیی هەبوو، هەموو ئەو فاکتەرانە یارمەتیدەری باش بوون لە بڵاوبوونەوەی ئاراستە فکرییەکانی قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامیی.

بێگومان بیری قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەیشتە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیو هەوادارو شوێنکەوتووی لە وڵاتە جیاوازەکاندا بۆ پەیدابوو، یەکێك لەو وڵاتانەی ئەو ئاراستە فکرییە ئیسڵاحییەی پێدەگات، کوردستانە، هەر لە سەرەتا سەدەی بیستەمدا (مەلای گەورەی کۆیە ١٨٧٦-١٩٤٣ز) رەنگە یەکەم کەس بێت دەکەوێتە ژێر کاریگەری قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامیو رەخنەی توند لە نێوەندە ئایینییە تەقلیدییەکە دەگرێتو بەگژ بیری دواکەتوو و خورافەدا دەچێتەوەو داوای هۆشیارکردنەوەی زانایانی ئایینو میللەتەکەی دەکات، لەهەمانکاتدا

داوای بیری نوێ‌و خوێندن‌و خوێندەوارییان لێدەکات‌و لەو پێناوەدا هەوڵی زۆر دەدات‌و هەموو قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی‌و لەسەر ڕێبازی قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی تەفسیر دەکات.

لە دوای مەلای گەورەی کۆیە، شێخ محەممەدی خاڵ (١٩٠٤ـ١٩٨٩ز) وەك زانایەکی گەورەو خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی لە شاری سلێمانیدا دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو قوتابخانەیە، شێخی خاڵ خۆی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کاتێك ژمارەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقى)ی دەستکەوتووەو خوێندوویەتیەوە لە جیهانێکەوە کەوتووەتە جیهانێکی دیکەو پەردە لەسەر چاو و دڵی لاچووە، هەروەها دەڵێ: "ئەو گۆڤارە سەدان کەسی لە خەوی بێئاگایی بێدارکردەوە، کە یەکیان خۆمم".

سەرەتا شێخ محەممەدی خاڵ لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بیری ئیسلاحیی خۆی بڵاودەکاتەوە، هەر ژمارەو ئایەتێکی قورئانی پیرۆز تەفسیر دەکات و داوای ریفۆرمی ئایینی‌و کۆمەڵایەتی دەکات‌و باس لە کێشە و دەردەکانی ئەوکاتی کۆمەڵگەی کوردەواری دەکات، پاشان هەر لەژێر کاریگەریی بیری جەمالەددینی ئەفغانیدا فەرهەنگی خاڵ دەنووسێت، کە هەتا ئێستا باشترین فەرهەنگی کوردی ـ کوردیە، لە پاشان، تەفسیری خاڵ بەپێی ڕێبازی قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی دەنووسێت‌و حەوت جوزئی قورئان تەفسیر دەکات و بە زمانی شیرینی کوردی بڵاویاندەکاتەوە.

لێرەدا کۆمەڵێك پرسیار خۆیان قوتدەکەنەوە: بۆچی شێخ محەممەدی خاڵ وەك شێخ محەممەد عەبدە و محەممەد رەشید رەزاو هاوڕێکانیان نەیتوانی لە نێو کۆمەڵی کوردەواری‌و نێوەندە ئایینییەکەدا وەك

ریفۆرمخوازێك دەربكەوێتو جوڵە و بزاڤێكی گەورە دروست بكات؟ ئەی بۆ نەیتوانی چەند مەلایەكی ڕۆشنفكری وەك خۆی پێبگەیەنێتو درێژە بە ڕێبازەكەی بدەن؟ ڕێگر و بەربەستەكانی بەردەم پڕۆژە ئیسلاحییو نوێخوازییەكەی چی بوون؟ بیری نوێخوازیی شێخ محەممەدی خاڵ چ كاریگەرییەكی لەسەر ناوندە ئاینییەكە هەبووە؟ تا چەند خزمەتی بە ناوەندە رۆشنبیرییەكەی كردووە؟ بیری نوێخوازی ئاینی تا چەند پێویستی كۆمەڵی كوردەواری بووە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری دیكە ئەم دیدارە رۆژنامەنووسییانە ئەنجام دراون، بەو هیوایەی خزمەتێك بێت بە خوێنەرانو توێژەرانو مێژووی زانایانی بیر ڕووناكو نوێخواز، خوای گەورە یارمەتیدەری هەمووان بێت.

# سەرەتا

## شێخ محەممەدی خاڵ، ریفۆرمخوازێکی سەردەمەکەی خۆی
## ١٩٠٤ ـ ١٩٨٩

زۆرن ئەو زانا کوردانەی بەدرێژایی مێژووی پڕ ناسۆرو هەڵدێرو نشێوەکانی وڵاتەکەیان هەموو کات بەگژ نەهامەتیەکاندا چوونەتەوەو لە تاریکیەکاندا چرایەکیان هەڵکردووەو لە نەبوون، بوونیان دروستکردووە، لەگەڵ ئەوەدا کە هیچ دامەزراوەیەکی زانستییو ئەکادیمی لە وڵاتەکەیاندا نەبووەو چەندین شاکارو داهێنانی گەورەیان پێشکەش بە گەلو نیشتمانەکەیان کردووە، بە لێبڕانو ماندوویی خۆیان چرای زانستو پێشڤەچوونیان بۆ هەڵکردوون، نەیانهێشتووە لە کاروانی شارستانیی دوابکەون، لەهەمانکاتدا زۆر کاری سەختیان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان ئاسانکردووەو هەموو (زۆربەی) لایەنەکانی ئەدەبو ئایین مێژوویان بۆ ڕووناککردوونەتەوە وەك ئاسۆی بەربەیان.

یەکێك لەو زانا بەهرەمەندە هەڵکەوتووانە، شێخ محەممەدی خاڵە (١٩٠٤–١٩٨٩) کە بەدرێژایی تەمەنی، خامە بە پێزەکەی لە خزمەتی ئەدەبو ئایینو زمانو مێژووی کورددا بووەو چەندین شاکاری ناوازەی

پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، شێخی خاڵ لە سەردەمێکدا چاوی کردووەتەوە کە کوردستان لەبەردەم جەنگی یەکەمی جیهانییدا بووە، ساڵی ١٩١٤ شێخی خاڵ تەمەنی ١٠ ساڵان بووە کە جەنگی یەکەمی جیهانیی هەڵدەگیرسێت، بێگومان ئەو جەنگەش کاریگەری راستەوخۆی لەسەر تەواوی کوردستان هەبووەو زۆرێك لە کێشەکان لەسەر خاکی کوردان یەکلاییکراونەتەوە، هەر ئەو جەنگە کاولکەرە چەندین نەهامەتی تووشی خەڵکی کوردستان کردووە، لە نەبوونیی و قاتوقڕی سەفەربەلكو تاڵانکردنی داهاتی وڵاتو وێرانکردنی ژێرخانی ژیانو هاتنی چەندین نەخۆشیو ناخۆشی دیکە، شێخ لە تەمەنی لاوێتیو گەشەکردنندا ئەوە حاڵی وڵاتو ناوچەکەی بووە، هیچ لەو فاکتەرانە، نەك هاوکارو یارمەتیدەر نەبوون کە خوێندنو زانست بەرەوپێش بچێتو مرۆڤ بتوانێت راژەی فکرییو رۆشنبیریی خۆی بکات، بەڵکو هەموویان رێگرو کۆسپی سەختی بەردەم خوێندنو گەشەی زانستیی بوون لە وڵاتدا، مرۆڤ هێندەی هەوڵی ئەوەی بووە لەتە نانێکی دەستبکەوێتو لە برساندا نەمرێت، بەهیچ جۆرێك بیری لە خوێندنو خواستە رۆشنبیرییەکانی نەکردووەتەوە.

هەموو ئەم کۆسپو رێگرە سەختانە نەیانتوانیوە بیری رۆشنگەرێکی ریفۆرمخوازی وەك شێخی خاڵ تاریك بکەن کە نەتوانێت درێژە بە خوێندنو زانست بدات، نەك هەر ئەوە، بەڵکو لە هەوڵی پەیداکردنو کۆکردنەوەی سەدانو هەزاران دەستنووسی بەنرخو کتێب و گۆڤاریشدا بێتو لەو رێگەیەشەوە زیاتر بیری ڕووناکی خۆی ڕووناکتر بکاتەوە.

له دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیی‌و له بیستەکانی سەدەی رابردوو بەدواوەو ئەو گۆڕانکارییه سیاسییانەی لەناوچەکەدا هاتنه گۆڕێ، وەك سەرەتای داگیرکاری کوردستان لەلایەن بەریتانیاوەو سەرهەڵدانی بزاڤی رزگارییخوازی کوردستان ـ بە رابەرایەتی شێخ مەحموودی حەفید ـ له ناوچەی سلێمانیدا و راگەیاندنی دەوڵەتی کوردستان و بزاڤی رۆشنبیری دەسەڵاتە کوردیەکەو هەڵایسانی شەڕی دەربەندی بازیان و ئاوباریك له ساڵی ١٩١٩ دژی بەریتانیا و داواکردنی مافی چارەی خۆنووسینی کورد لەلایەن شێخ مەحموودو شۆڕشەکەیەوە، هەروەها کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان‌و دروستبوونی دەوڵەتانی نەتەوەیی له ناوچەکەدا، هەموو ئەمانه رۆڵی گەورەیان هەبووە له بەجۆش‌و خرۆشخستنی بیری رۆشنگەریی لای لاوێکی بیر ڕووناکی وەك شێخی خـاڵ.

هاتنی ئینگلیز بۆ سلێمانی‌و هێنانی چاپخانەو دەرکردنی (تێگەیشتنی ڕاستی) له بەغدادو (پێشکەوتن) له سلێمانی، سەرەتای سەرهەڵدانی بزاڤی رۆژنامەنووسیی‌و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی فاکتەری باش بوون کە شێخی خاڵ خولیای نووسین‌و هەوڵی رۆژنامەنووسیی لای گەشە بکات‌و بکەوێتە نێو دونیای نووسین‌و رۆشنبیرییەوە، هەر لەوێوە بیری رۆشنگەریی لای خاڵ سەرهەڵدەدات، رۆژبەرۆژ بیری ڕووناکتر و فراوانتر دەبێت‌و دەبێتە موریدێکی دڵسۆزی بواری رۆشنبیریی‌و ئەدەب‌و خوێندنەوەو دەکەوێتە هەوڵی پەیداکردنی هەموو نووسین و کتێب و گۆڤارێکی ئەو سەردەمە، بەمەش له بزاڤی رۆشنبیری سەردەمەکەی خۆی بە ئاگا بووە، له ڕێگەی خوێندنەوەو هەوڵی پەیداکردنی بڵاوکراوەکانی دەرەوەی کوردستانی

ڕۆژگاری خۆیشیەوە، ئاگاداری قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی (مدرسة الإصلاح الإسلامي) جەمالەدینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە و محەممەد ڕەشید ڕەزا دەبێت، لەژێر کاریگەریی ئەدەبیاتو تێزەکانی ئەو قوتابخانەیەدا گۆڕانێکی ڕیشەیی لە هزرو فکرو تێگەیشتنی بۆ مەسەلە ئایینییەکان ڕوودەداتو بە تەواوی هۆگری ئاراستە فکرییەکانی ئەو قوتابخانەیە دەبێت، لەدوای ئەوە هێڵە فکرییەکانی ئەو قوتابخانەیە زۆر بە ڕوونی لە نووسینەکانییدا، بەتایبەتی لە تەفسیرەکەیدا ڕەنگدەداتەوە.

## شێخی خاڵو قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامیی

هەتا ئێستا کاتێك باس لە قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە و قوتابییەکانیان دەکرێت، باس لە زانایەکی وەك شێخی خاڵ ناکرێت، کە هەمان ڕێچکەی ئەوانی گرتووەو هیچی لەوان کەمتر نییە، بێگومان ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە، بەو هیوایەی لەمەودوا توێژەران گرنگی پێبدەنو زانایەکی گەورەی وەك شێخی خاڵ هەقی خۆی بدرێتێ. پێش ئەوەی بێینە سەر بیری ریفۆرمخوازیی شێخی خاڵ، پێویستە ئاماژە بە سیما و تایبەتمەندییە دیارەکانی قوتابخانەی ریفۆرمی فکری ئیسلامیی بکەین:ـ

یەکەم: یەکێك لە سیما هەرە دیارەکانی قوتابخانەی شێخ محەممەد عەبدە، بەگژداچوونەوەی تەقلیدو بیری چەقبەستووی ئایینی بووە، کەچەند سەدەیەك بوو هەموو دەرگاکانی ئیجتیهادو نوێبوونەوە داخرابوونو زانایان هەر قسەی زاناکانی پێش خۆیان دووبارە دەکردەوە، ئەمەش گەورەترین

تەنگەژەی فکریی‌و خوێندنەوەی نوێی بۆ ئایین‌و هەڵکردن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا بۆ جیهانی ئیسلامی دروستکردبوو، بەجۆرێك، هەندێك وەهابیریان دەکردەوە کە ئایینی ئیسلام ناتوانێت هاوشانی گۆڕانکارییەکانی سەردەم هەنگاو بنێت‌و چەرخی زێڕینی بەسەرچووە، هەرئەمەش وایکرد زانایانی ریفۆرمخواز دەربکەون، هەریەك لە کەواکبی، جەمالەددینی ئەفغانی، شیخ محەممەد عەبدە، محەممەد رەشید رەزا و شێخ محەممەد مستەفا مەراغی و... شێخ محەممەدی خالیش (لە کوردستان) کەوتنە هەوڵی شکاندنی دیواری تەقلیدو توانیان تازەبوونەوەو گۆڕانکاری لە بیری چەقبەستووی سەردەمەکەی خۆیاندا بکەن‌و بە شێوەیەکی سەردەمییانە تەفسیری دەقە ئایینییەکان بکەن.

دووەم: یەکێکی دیکە لە سیما و تایبەتمەندیی ئەم قوتابخانەیە گرنگییدانیان بوو بە لایەنی ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتی، ئەم هەوڵدانە کە بە (مدرسة اللون الأدبي والاجتماعي) ناسراوە، گرنگییەکی زۆری داوە بە بوارەکانی ئەدەب‌و ریفۆرمی کۆمەڵایەتی‌و رزگارکردنی کۆمەڵگا لە کەلتووری کۆن‌و بەسەرچوو.

سێ یەم: زانایانی ئەم قوتابخانە فکرییە پابەند نین بە هیچ ڕێبازێکی فقیهی (المذهب الفقهي)یەوە، زۆر گرنگی بەو لایەنە نادەن، بەڵکو زیاتر گرنگی بە کرانەوەو بیری ئازادی ئایینی دەدەن، نەك خۆقەتیسکردن لە رێبازێکی فیقهیی دیارییکراودا، هەر ئەمەش یەکێکە لە خاڵەکانی سەرکەوتنیان‌و لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا خوێندنەوە بۆ

ئەدەبیاتیان دەکرێتو کەس سڵ ناکاتەوە لێیان بەهۆی جیاوازی مەزهەبیەوە، هەر ئەمەش زیاتر بەرەو کرانەوەو رزگاربوون لە تەقلید دەیانبات.

چوارەم: زانایانی ئەم قوتابخانەیە زۆر دژایەتی ئیسرائیلیاتو خورافەو فەرموودەی لاواز (ضعیف)و هەڵبەستراو (موضوع) دەکەنو هەوڵی پاککردنەوەی ئەدەبیاتی ئیسلامی لەو شتانەی کە کاریگەریی خراپیان بەسەر موسڵمانانەوە بەجێهێشتووە، دەدەن.

پێنجەم: عەقڵانییەتو ئازادی عەقڵ لە هەرە سیما دیارەکانی ئەم قوتابخانەیەیە، لەو کاتەدا کە بانگەوازی ئەوە دەکرا کە دەبێت عەقڵی موسڵمان دابخرێتو مرۆڤ دەبێت کوێرانە شوێنی دەقەکانو فیقهی زانایانی پێشوو بکەوێت، ئەمان بانگەوازی ئەوەیان کرد کە خوای گەورە ڕێزی زۆری عەقڵی مرۆڤی گرتووەو نابێت مرۆڤ کوێرانە تەقلید بکاتو هیچ گرنگیی بە ژیریی‌و فکری خۆی نەدات، بەڵکو پێویستە جارێکی دیکە عەقڵی مرۆڤ شوێنی شایستەی خۆی وەربگرێتو لەسەر بەرچاوڕوونیی (البصيرة) شوێن شتەکان بکەوێت.

شەشەم: هەوڵدان بۆ پێکەوەگرێدانی زانستو بیردۆزە زانستییەکانی سەردەم لەگەڵ گیانی ئیسلامدا و سەلماندنی ئەوەی کە ئایینی ئیسلام دژی زانست نییە، بەڵکو ئیسلامو زانست تەواوکەری یەکترن، هەردووکیشیان ژیانێکی پڕ خۆشی بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکەن، بێ زانست مرۆڤ ناتوانێت

سەر زەوی ئاوەدان بكاتەوە كە ئەركو كاری مرۆڤە و هەر بۆ ئەو مەبەستەش دروستكراوە.

تەنانەت لەم بوارەدا هێندە زێدەڕەوییان كردووە ئەو بیردۆزانەی كە ئەمڕۆ نازانستیبوونیان دەركەوتووە، ئەوان بەڵگەی قورئانیان بۆ هێناوەتەوە، كە ئەمە زانستە و قورئان پشتگیریی دەكات[1].

حەوتەم: گۆڕانكارییەكانی سەردەم، گۆڕانكاری سیاسیو كۆمەڵایەتیو زانستیو كێشەی ژنانو لاوان، لە ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیەدا رەنگدانەوەی تەواوی هەیە و جێگەی گرنگیپێدانیان بووە[2].

## خوێندنەوەیەكی خێرا بۆ تەفسیری خاڵ

شێخی خاڵ بۆ یەكەمجار لەساڵی ١٩٣٥ز تەفسیری سورەتی (الفاتحة) دەكات، بەم هەوڵەشی دەچێتە ڕیزی پێشڕەوانی نووسینی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زمانی كوردی.

پاشان لە شەستەكانی سەدەی رابردوودا، هەر لە جزمی یەكەمەوە دەست بە نووسینی تەفسیری قورئانی پیرۆز دەكات، بەو هیوایەی هەموو قورئان تەفسیر بكات، بەڵام پاش ئەوەی سێ جزمی یەكەمی قورئان تەواو دەكات، وەك خۆی دەڵێت لەبەرئەوەی جزمەكانی كۆتایی قورئان زیاتر

---

(١) بۆنمونە سەیری تەفسیری ئایەتی : (أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً) ئایەتی١٥ سورەتی نوح. بكە، تەفسیری خاڵ، جزمی٢٩ ل ١٤٨ بەدواوە بكەو وە لە زۆر جیگای تردا.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر سەیری: الدكتور محمد حسين الذهبـي، التفسير والمفسرون، م٢ص ٥٤٨و بەدواوە بكە.

جێگەی خوێندنی قوتابیانو سوختە و فەقێکان بووە، بیرۆکەی ئەوەی لاگەڵاڵە بووە کە هەوڵی ئەوەبدات جارێ ئەم جزمانەی کۆتایی قورئان (عمَّ، تبارك، قد سمع الله، الذاريات) تەفسیر بکات، بەڵام ئیتر مەرگ رێگەی نەداوەو بە نیوە ناچڵی تەفسیرەکەی بەجێدەهێڵێت، بۆ هەتاهەتایی ماڵئاوایی لە تەفسیری خاڵو کاروانی پیرۆزی نووسینو رۆشنگەرییو سەرجەم هیواو پڕۆژە پڕخێرەکانی دەکاتو بۆ لای پەروەردگار دەگەڕێتەوە.

## سەرچاوەکانی تەفسیری خاڵ بەگشتی

شێخی خاڵ لە تەفسیری هەموو جزمەکاندا، پشتی بە زانایانی تەفسیری قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی بەستووە بەگشتی، بەتایبەت دیارەکانیان، هەر ئەمەش وای کردووە بیری ئەو قوتابخانەیە بەتەواوەتی لە نێو تەفسیرەکەیدا رەنگبداتەوە.

لەلاپەڕە (٣٠٠) ، جزمی بیستو نۆهەمدا بەم شێوەیە سەرچاوەکانی ڕیز دەکات:

یەکەم: تەفسیری (المنار) دانراوی سەید محەممەد رەشید رەزا، قوتابی محەممەد عەبدە و یەکێك لە دیارترین ڕابەرانی قوتابخانە ئیسلاحییەکەی.

دووەم: تەفسیری شێخ محەممەد عەبدە ـ ڕابەری دووەمی قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی ـ دوای مامۆستاکەی ـ جەمالەددینی ئەفغانی.

سێهەم: تەفسیری (في ظلال القرآن)ی سەید قوتب، دێژکراوەو درێژەپێدەری قوتابخانەی ئیسلاحی محەممەد عەبدە لە وڵاتی میسردا.

چوارەم: تەفسیری شێخ ئەحمەدی مەراغی ـ یەکێکی دیکە لە زانایانی قوتابخانەی ئیسلاح .

پاش ئەمانەش، هەریەك لە تەفسیری (القاسمی، محمد عزت دروزە، عبدالقادر مغربی، محمود محمد حمزة، أحمد مظهر عزمة و.. گۆڤاری (نور الإسلام) کە لەلایەن زانا بیر روناکەکانی زانکۆی ئەزهەرەوە دەردەچوو، سەرچاوەی تەفسیری خاڵن[1] .

جگە لە تەفسیرەکەی، ئەو کتێب و گۆڤارو بڵاوکراوانەی لەسەردەمی خاڵدا لە میسر و زانکۆی ئەزهەر و دامەزراوەو دەزگا رۆشنبیرییەکانەوە دەرچوون شێخی خاڵ پەیدای کردوون و خوێندونییەتەوەو زاخاوی بیرو هۆشی خۆی پێکردوون، هەروەها ئاگاداری جموجوڵە سیاسیو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی ئیسلامی بووەو هەموو ئەو نووسینو بڵاوکراوانەوە سەرچاوەی بیرو ئەندێشەو نووسینەکانی خاڵ بووە بەگشتی.

کاتێك خاڵ ئەم تەفسیرانە دەکات بە سەرچاوەی نووسینەکەیو ئاماژە بە تەفسیرە پێشووەکان نادات، بەڵگەیەکی روونە کە ئەمیش هەمان ڕێبازی ئەوانی گرتووەو زۆر بەلایەوە پەسەندبوون، ویستوشیەتی شێوازی کۆنی پێشوو تێپەڕێنێتو هەوڵی نوێبوونەوە بدات لەنێو فەزای دینداری کوردستاندا.

کاتێك خاڵ بیری ریفۆرمو نوێکردنەوەی ئاینی هەبووە، زۆر کەم ئەو جۆرە بۆچوونانە لای ناوەندە ئایینییە باوەکە قبوڵکراو بووەو زۆر کەم

(١) بڕوانە تەفسیری خاڵ، جزمی بیست نۆهەم، ل ٣٠٠.

نوێبوونەوەو گۆڕانکاریی لەو ناوەندە تەقلیدیەدا کراوە، بەڵام زانای بیر ڕووناک، مامۆستا خاڵ، هەر لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە چرای نوێبوونەوەی هەڵکردووەو زەمەنی خۆی تێپەڕاندووە، دەتوانین بڵێین زیاتر لە نیو سەدە پێش سەردەمی خۆی کەوتووەو بانگەوازی نوێگەریی لە میتۆدی فیکری ئیسلامیدا کردووە.

## پێکەوەگرێدانی قورئانو زانستی نوێ

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی تەفسیری خاڵ ئەوەیە مامۆستا وەك زانایەکی بیر کراوەو ڕۆشنگەر هەوڵی داوە تەفسیری قورئانو زانست پێکەوە گرێبدات، کە بەداخەوە لە لایەن هەندێك لەزانایانی ئایینەوە دژایەتی زانستو ڕۆشنبیریی کراوە لەو سەردەمەدا کە شێخی تێدا ژیاوە، لەوانەیە هەتا ئێستاش هەندێك لەو بیرکردنەوە دۆگما و کەسە تاریکبیرانە هەبن، بەڵام مامۆستای خاڵ زۆر بوێرانە بەگژ ئەو جۆرە بیرکردنەوانەدا چووە، خوێندنەوەیەکی وردی بۆ داهێنراو و بیردۆزە زانستیەکانی ڕۆژگاری خۆی هەبووە، چەندیش بۆی کرابێت هەوڵیداوەو لەگەڵ تەفسیرەکەیدا پێکەوە جۆشیداون، بۆ نموونە لە تەفسیری ئایەتی (الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا..) دەفەرموێت مەبەست لەم حەوت ئاسمانە، حەوت ئەستێرەن لەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە بەدەوری ڕۆژا ئەسوڕێنەوە، وە ئاسمانن بۆ زەوی[1].

---

١ - سەیری: تەفسیری خاڵ جزمی بیستو نۆ، ل٦-٧ بکە. ڕاستە ئەمە بۆچوونی شێخی خاڵو زۆرێك لەو تەفسیرانەیە کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا نووسراون، بە تایبەتی تەفسیری زانایانی

دوای ئەوە، بەدرێژی باس لەو حەوت ئەستێرەو ناوی هەریەکیان‌و سوورانەوەیان بەدەوری زەوی‌و لە چەمەرەی خۆیاندا دەکات، ئەم بوێریەی مامۆستای خاڵ لەو کات‌و سەردەمەدا زۆر گەورەو گرنگ بووە، ویستوویەتی بەگژ چەقبەستوویی‌و بیری دۆگمادا بچێتەوە و بانگەوازی گۆڕنکاریی بدات.

لەتەفسیری ئایەتی (١٥) سورەتی نوحیشدا: (أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا)[١] ئاماژەی بەم باسە داوە[٢].

هەروەها لە تەفسیری ئایەتی: (وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا)[٣] لە تەفسیری (وشهبا)دا شێخی خاڵ لە تەفسیرە ئایینییەکان لادەدات‌و دەیەوێت بە شێوەیەکی زانستی ماددیی تەفسیری بکات، دەڵێت:"بە واوی عاتیفە لە (حرساً شدیداً) جیاکراوەتەوەو دەبێت دوو شتی جیاواز بن، باسیش لەوە دەکات لە ساڵی ١٩٥٥ لیژنەی زەڕڕە بڵاویکردەوە کە دکتۆر (ئیرنست لورنس) ئەتۆمێکی یاخی دۆزیەوە لە کارگەی زەڕڕە لە زانستگای کالیفۆڕنیا کە بیست‌و پێنج ساڵە زانایانی زەڕڕە لێی ئەترسن.

---

قوتابخانەی ڕیفۆرمی ئیسلامیی، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا ئەو جۆرە بیردۆزەو بۆچوونانە زانستیبوونی خۆیان لە دەستداوە. نووسەر.

[١]- سورة نوح، الآية: ١٥.

٢ - تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل١٤٨.

[٣]- سورة الجن، الآية: ٨.

باس لەوەش دەکات کە ئەم پاسەوانە هەر پارچە ئەستێرەیەك بەرەو زەوی بێت پیاهەڵ ئەتەقێت‌و نامێنێت، بەمەش خوای گەورە زەوی‌و گیانەوەرانی سەرزەوی لەو پارچە ئەستێرانە پاراستووە[1].

بەم شێوەیە، مامۆستای خاڵ کاریگەر بووە بە زانست‌و رۆشنبیریی سەردەم، بەڵام مەرج نییە هەر بیردۆزەیەك مامۆستا لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە هەمووی راست بێت، راستە شتی زانستیی سەلمێنراو ناگۆڕێت، بەڵام بیرۆدۆزەکان زۆریان گریمانەن‌و هەندێکیان بە پێشکەوتنی زانست، نازانستییبوونیان روون دەبێتەوە.

## عەقڵانییەت لای مامۆستا خاڵ

مامۆستا هەروەك زانایانی ئیسلاحیی پێش خۆی، گرنگی زۆر بە عەقڵ‌و ژیریی مرۆڤ دەدات، زۆرێك لەو ئایەتانەی باس لە غەیبانییەت‌و شتە نادیارەکان دەکەن هەوڵدەدات تەفسیری عەقڵانیی‌و ماددییان بۆ بکات، هەتا بتوانێت لەگەڵ بزاڤی رۆشنبیریی‌و فکریی سەردەمەکەی خۆیدا بیگونجێنێت، بەتایبەت کە لە سەردەمی ئەودا بیری ماددییەت هەژموونی هەبووە، ئەمیش لە سەنگەری بەرگرییدا بیرو داهێنانی خۆی دارشتووە، کە زۆرجار لەوانەیە وەك پەرچەکرداریش کاری کردبێت، بۆ نموونە لە تەفسیری ئایەتی: (وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانيية)[2]، شێخی خاڵ دەڵێت:

---

١ - تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل١٧٣-١٧٤.

٢- سورة الحاقة، الآية:١٧.

مەبەست لە عەرش، گەورەیی‌و دەسەلاَت‌و دەستڕۆینە، ئەم ئایەتە نموونەهێنان (تمثیل)ە بۆ باسی گەورەیی‌و دەسەلاَتی خوا لە ڕۆژی دواییدا[1].

لێرەدا شیخ هێندە دەسەلاَتی عەقڵی ڕەها کردووە، هەوڵی داوە مانای ئایەتەکە لە رووکار (ظاهر)ی خۆی لابدات‌و تەئویلێکی دووری بۆ بکات، کە ئەمەش لای زانایانی تەفسیر قبولْ نییە و بە تەحریف ناوی دەبەن، باشە ئەگەر مەبەست لە عەرش دەسەلاَت بێت‌و دەسەلاَتیش شتێکی مەعنەویە و بەرجەستە نییە، بۆچی خوای گەورە باس لە هەڵگرتنی دەکات (ویحمل عرش ربك)، بێگومان لێرەدا عەقلْ ڕێگەی تێڕامانی نامێنێت‌و یەکێکە لەو مەسەلە ئایینیانەی چۆنییەتیەکەی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو زانایان بە (الأمر التفویضي) ناوزەدی دەکەن.

هەروەها لە سەرەتای سورەتی (الجن)دا، شێخی خالْ دێت بە شێوازێکی لۆژیکی مرۆڤ دەدوێنێت‌و باس لەوە دەکات بەشێوەیەکی عەقلاَنیی قەناعەت بە بەرامبەرەکەی بهێنێت کە جیهانی جنۆکە هەیە و عەقڵی مرۆڤ وەریدەگرێت کە جیهانێکی گیاندار هەبێت خوا لە ئاگر دروستی کردبێت، بەلاَم ئێمە بەچاو نەیبینین. دەڵێت: خوا گەلێ جۆرە گیانداری هەیە، هەندێکیان بە هەوا ئەژین، لەگەلْ لە ئاوانقوم بوون ئەخنکێن، هەندێکیان لەئاوا ئەژین لەگەلْ لە ئاو هاتنە دەرەوە ئەمرن، ئنجا هەروەك ئەمانە هەیە، با جۆرە گیاندارێکیش ببێ لە ئاگر دروستکرابێ، ئێمە نەیبینین، هەرچیش ئێمە نەیبینین مانای وانییە کە نییە، چونکە ئەو گیانەی کە لە بەرمانایە، لە

---

١- تەفسیری خالْ، جزمی ٢٩، ل٩٢-٩٣. خالْ لێرەدا ئاماژە بە تەفسیری القاسمی (یەکێکە لە زانایانی قوتابخانەی ئیسلاح) دەکات و ئەم باسەی لەو وەرگرتووەو هەمان ڕێچکەی ئەوی گرتووە.

هەموو شت نزیكترە لێمان، نە بە چاو ئەیبینین، نە بە لووت بۆنی ئەكەین، نە بە گوێ ئەیبیستین، نە بەدەست دەستمان بەری ئەكەوێ، نە بە دەم تامی ئەكەین، كەچی بێگومانیشین كە هەیە، كە وابوو با فریشتەو جنۆكەش شتێك بن وا[1]. نموونەی دیكە زۆرە لە تەفسیرەكەیدا و لێرەدا جێگەی نابێتەوە هەمووی باس بكرێت.

## ریفۆرمی كۆمەلایەتی لە (تەفسیری خالْ)دا

لە رۆژگاری مامۆستا خالْدا، كوردستانو كۆمەڵی كوردەواری تەواو گیرۆدەی دەردی نەزانیو نەخوێندەواری بووبوو، ڕێژەی نەخوێندەواریی زۆر بەرز بووەو كۆمەلگە لە هەموو رووەكانی ژیانەوە تەواو دواكەوتوو بووە، بۆیە شێخی خالْ هەمووكات ویستوویەتی لە رێگەی خامەكەیەوە گەلەكەی هۆشیار بكاتەوەو بەردەوام بە نووسین بانگی كردوون بۆ خوێندنو خوێندەواری، چەندین وتاری لەم بوارەدا نووسیوە، بەردەوام لە تەفسیرەكەشیدا هەر ئایەتێك باسی ریفۆرمی كۆمەلایەتی كردبێت، ئەو دەرفەتەی قۆستووەتەوە، بە زمانێكی شیرینو گرێدراو بە قورئانەوە بانگی گەلەكەی كردووەو داوای گۆڕانكارییو ئیسلاحی كۆمەلایەتی لێكردوون، بۆ نموونە لە تەفسیری ئایەتی: (هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)[2] دەفەرموێت: بەڕاستی ئەم زەویو زار و ئەرز و ئاوەی خوا پێیداوین، هەر گەلی زیندووی خواپێداو ئەزانێ بەهرەی

١- تەفسیری خالْ، جزمی ٢٩، ل١٦٣.

٢- سورة الملك، الآية: ١٥.

لێوەرگرێ، بچۆ بە خاکیانا بگەڕێ، هەمووی باخ و باخات و دارو درەختە، دەغڵو دانو رەزە و سەبزە و جەنگەڵستانو لەوەڕە، لە هەموو لایەکەوە رێگا و شەقام و ئوتۆمبەیلو شەمەندەفەرو ئەلەکتریك و چراخانە، هەر شاخەو کون کراوە، هەر ماهی زەردەو قەدبڕ کراوە، هەر تەپە و گردە و تەخت کراوە، هەر چاڵ و چۆڵەو پڕکراوەتەوە، لە پاشا چوونە ژێر دەریا و هەمووی بینرا، ئنجا کەوتنە حەوا و هەمووی پێورا، هەموو سەر زەوی وەك تانوپۆ بە خەتی ئاسن تەنرا، هەر شەمەندەفەرە و وەك ڕەشمار بەشاخا هەڵ ئەگەڕێ، یا بەناو جەرگیا هاتووچۆ ئەکاتو دائەگەڕێ، هەر فڕۆکەیەو بە ئاسمانا ویزەی دێ، هەر کەشتیە و بەسەر دەریادا هاژەی دێ، نهێنی سروشتیان دۆزیەوە، دەستوورو باوی ماددەیان کۆڵیەوە، هەرچی گژوگیا هەیە هەمووی لەیەك جیاکرایەوە، زۆربەی گیانلەبەران رام و کەوی کران، هەرچی کان هەیە هەمووی توێنرایەوەو داڕێژرا، ئەی موسڵمانی نوستوو، تاکەی خەبەرت نابێتەوە، تاکەی بەتەمەڵی و تەوەزەلی ئەمێنیتەوە، تاکەی سواڵکەری، تاکەی رووتیو رەجاڵی، تاکەی نەخۆشیو برسێتی، تاکەی نەخوێندەوارییو نادانی، تاکەی پیسیو پۆخڵی، تاکەی چڵکنیو کولکنی، تاکەی پڕوپووچ پەرستی، ئیتر بەسە، ئاوڕێك لە قورئانەکەت بدەرەوەو نەختێك لێی ورد بەرەوە، بزانە چی ئەفەرموێ، بە قسەی بکە و لە فەرموودەی دەرمەچۆ، سا بەڵکو خوا ئاوڕێکت لێبداتەوە[1].

مامۆستا خاڵ لێرەدا کە سەیری باری ژیانو ئاستی کۆمەڵایەتی موسڵمانان دەکات بەم شێوە دواکەوتووە لە هەموو رووەکانی ژیانەوە،

---

[1]- تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل١٩-٢٠.

سەیری هاندانە قورئانییەکەش دەکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی ژیانو سەرزەوی، لە رووی پرسیارو بێزارییەوە روو لە گەلەکەی دەکاتو ئەم هەموو پرسیارەیان ئاراستە دەکات هەتا بێداریان بکاتەوە، هەندێکجار ئەم دواکەوتوویەش بەرگی ئایینی لەبەر کراوە، بۆیە داوا دەکات موسڵمان لە قورئانەکەی وردبێتەوەو لێیرامێنێتو بزانێت قورئان کەسی ناهۆشیارو بێئاگای ناوێت، بەڵکو قورئان بانگەواز بۆ گەلێك دەکات کە بتوانێت سەرزەوی ئاوەدان بکاتەوە.

هەروەها لە تەفسیری ئایەتی: (ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ)[1] دەفەرموێت: هەروەخت بتەوێ لە گەورەیيو بەرزی گەلێك بگەیت، وەرە تەماشای نووسینو نووسراوی ئەو گەلە بکە، تا ئەمانەی زۆربێ، ئەوە نیشانەی بەرزییەتی، تا ئەمانەی کەمتر بێ، ئەوە نیشانەی پەستيو نزمیەتی، چونکە بەراستی هەر نووسینو نووسراوە، ترازووی قورسيو سووکی، بەرزيو نزمی گەلان، هەر نووسینو نووسراوە کە پایەی گەلان بەرز دەکاتەوە، هەر نووسینو نووسراوە گەلان ئەباتە ریزی پێشەوە، لەگەڵ گەلانی زیندووی خواپێداوا، راستیان ئەکاتەوە[2].

لێرەدا شێخی خاڵ وەك پسپۆرێکی کۆمەڵایەتی دەیەوێت کە گەلەکەی لە نادانی هۆشیار بکاتەوە، دەرگای زانستو خوێندەوارییان بۆ واڵا بکاتو لەوێوە لە دەردی نەزانيو دواکەوتوویی رزگاریان بکات.

[1]- سورة القلم، الآية: ١.

[2]- تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل٤٥.

هەڵگۆزینی فقهیی (الاستنباط الفقهي) نوێ - وەك ئیجتیهادێکی سەردەمییانە - یەکێکی دیکەیە لە جورئەتە ناوازەکانی مامۆستا خاڵ، بۆ نموونە لە تەفسیری ئایەتی: (وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ)[1]. دەڵێت: خوا بەم ئایەتە و گەلێ ئایەتی دیکە پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە یارمەتی هەژاران بدەن، هاناهانای مەردوم بدەن لەسەر دەستگرتنو یارمەتیدانیان، کە ئەمەش شێوەی کۆمەڵانی چاکە (جمعیاتی خیری)، کەوابوو قورئان بەم ئایەتە، بە ئایەتی سورەی (الفجر)یش کە دەفەرموێ: (كَلاَّ بَل لاَّ تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ (١٧) وَلاَ تَحَاضُّونَ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ)٢. ئایەتی سورەی (الماعون)یش کە ئەفەرموێ: (أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ (١) فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ)[3]. پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان کە لە هەموو شارێك کۆمەڵانی چاك رێکبخەن، هەوڵبدەن بۆ یارمەتیو دەستگرتنی هەژاران، بۆ رزگارکردنی خۆیانو ماڵو منداڵیان لەدەست هەژاریو نەخۆشیو نەخوێندەواری[4].

شێخی خاڵ کاتێك ئەم فیقهە جوانەی داڕشتووەو بانگەوازی بۆ دروستکردنی ڕێکخراوی کۆمەڵی مەدەنی کردووە، لە تەواوی وڵاتەکەیدا تەنانەت یەك رێکخراوی مەدەنیش نەبووە، هەموو دەنگێکی مەدەنیو ریفۆرمخواز تیرۆر کراوە، بەهۆی ئەو رژێمە دواکەوتوو و تۆتالیتارانەی کە

---

[1]- سورة الحاقة، الآية: ٣٤.

[2]- سورة الفجر، الآيتان: ١٧-١٨.

[3]- سورة الماعون، الآيتان: ١-٢.

[4]- تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل١٠١-١٠٢.

حکومڕان بوون، بەڵام ڕۆشنگەرێکی وەك مامۆستا خاڵ دەیەوێت بەگژ هەموو ئەو کۆسپو تەگەرانەدا بچێتەوەو بانگی چاکسازیی خۆی داوە.

ئەم نموونانە و سەدان نموونەی دیکە لە تەفسیری خاڵدا کە مامۆستا خاڵ وەك زانایەکی بیر ڕووناكو ڕۆشنگەر لە خەمو پەژارەی گەلەکەیدایەو دەیەوێت بانگیان بکات بۆ ریفۆرم و گۆڕانی ئەو بارودۆخە چەقبەستووە دواکەوتووەی کە تێیدا تلاوەتەوە، دەتوانین بڵێین شێخی خاڵ هیچی کەمتر نییە لە زانا ریفۆرمخوازەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو، بەڵام مەخابن هەتا ئێستا ئەم لایەنەی ژیانی فەرامۆشکراوەو لێکۆڵینەوەی زانستیی لەسەر نەکراوە !.

یەکێکی دیکە لە لایەنە ناوازەکانی تەفسیرەکەی، لایەنی زمانەوانیو سەلیقەی زمانناسی مامۆستای خاڵە، کە بە زمانێکی کوردی رەوانی هێندە بەرز نووسراوە، کاتێك خوێنەر دەچێتە نێو لاپەڕەکانیو لەگەڵ وشەکانیدا تێکەڵ دەبێت، تەواو خوشنوود دەبێت، لەگەڵ پەیڤو دەستەواژەو رستەکانیدا خەندە دەیگرێتو وا لە مرۆڤ دەکات کە شانازی بە زمانەکەیەوە بکاتو دڵخۆش بێت کە فەرهەنگی زمانی گەلەکەی هێندە دەوڵەمەندە، بۆ نموونە سەیری ئەم وشانەبکەن: (ئەتریسکێتەوە، بەیەکا هەڵتەقین، بۆڕی بدەیت، لە رووی سەرکۆنەوە، چڵو چێو، ڕام و کەوی، مەردوم، زانستگا، بیّ نمود، کەللەشەق، سەهەندە و.. چەندانی دیکەیش.

هەروەها لە هەندێك شوێندا بە زمانێکی شیعریی زۆر بەرز دەدوێت کە مرۆڤ سەراسیمە دەکات، با پێکەوە سەیری تەفسیری ئەم ئایەتانە بکەین: (كَلاَّ وَالْقَمَرِ (٣٢) وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ (٣٣)وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ)[١]. چەشمەندازی

١ - سورة المدثر، الآيات: ٣٢-٣٣-٣٤.

مانگو چەشمەندازی دوایی شەو و چەشمەندازی دەمەدەمی بەیان، کە تاریکی شەوی بەرەبەرە تیا رووناك ئەبێتەوە، ئنجا جیهان سپی ئەبیٚو سوور هەڵئەگەڕیٚو گزنگ ئەداو تیشکی رۆژ بڵاودەبێتەوە، کە ئەمانە سیٚ چەشمەندازی زۆر دڵگەشو گرنگن، کە هەر یەکێکیان چەند چەشمەندازێکی جوانو دڵڕفێنی لەناوایە، ئەگەر قورئان بیرمان نەخاتەوە، بەدرێژایی ساڵ بیرمان ناکەوێتەوەو لێی ورد نابینەوە[1].

ئەم زمانپاراویو توانا بەرزەی مامۆستا خاڵ، ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە زمانی کوردی زمانێکی دەوڵەمەندەو توانای کێبڕکێی لەگەڵ زمانە دەوڵەمەندەکانی جیهاندا هەیە، لە کاتێکدا هەندێك دەیانووت ناتوانرێت بە زمانی کوردی تەفسیری قورئان بکرێت، چونکە قورئان بە زمانێکی دەوڵەمەندی وەك زمانی عەرەبی دابەزیوەو زمانی کوردی زمانێکی دەستکورتو کەمدەرامەتە، ئا لەو کاتەدا مامۆستا خاڵ، بە قەڵەمە درەوشاوەکەی تەفسیری قورئان بە زمانی کوردی دەنووسێت، ئەو بۆچوونەش ئاوەژوودەکاتەوە، گەورەترین خزمەتیش لەیەککاتدا بە قورئانو ئیسلام و کوردو زمانی کوردی دەکات.

**پ.ی.د. ئاراس محەممەد ساڵح**

**مامۆستای زانستە ئیسلامییەکان**

**زانکۆی سلێمانی ٢٠١٤:٣:٣**

---

١ - تەفسیری خاڵ، جزمی ٢٩، ل٢٣٣.

## دیمانەی یەکەم

# دیداری مامۆستا مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەڕێز مامۆستا مەلا مەحموودی گەلاڵەیی (ناسراو بە مەلا مەحموودی ئەوقاف)، ساڵانێك پەیوەندی زۆری لەگەڵ مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵدا هەبووەو ئاگاداری کاروباری زانستیو رۆشنبیریو بیرکردنەوەی یەکتربوون، بێگومان لەو ساڵانەدا زۆر باسو خواسو مەسەلەی زانستییو فکرییان خستووەتە بەر لێکۆڵینەوە، هەردوولایان لە خەمی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییو زانستیی کوردییدا بوون، لەم سۆنگەیەوە ئێمەش بۆ ئاگاداربوون لە زۆر گۆشەی گرنگی ژیانی زانستی و رۆشنبیری شێخی خاڵ، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا.

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا مەحموود، پەیوەندی بەڕێزتان‌و شێخی خاڵ چۆن بووە؟ سروشتی پەیوەندییەکەتان تا چ ئاستێك بووە؟**

مامۆستا مەحموود: مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ، زۆری حەز لە کۆکردنەوەو پاراستنی کەلەپوور (تراث)ی ئیسلامی بە گشتی و بەرهەمی زانایانی کورد بە تایبەتی، هەبووە، لە سەردەمی فەقێیەتیەوە ئەم خولیایەی تێدا پەیدابووەو رۆژ دوای رۆژیش زیاتر گەشەی کردووە، تەنانەت ساڵی ١٣٤٧ کـ کە (تقریظ)ی لەسەر گلنبوی بورهان نووسیوەو کورتەیەك لە ژیانی دوو زانای وڵاتی سلێمانی مەلا عەبدوڕڕەحمان پێنجوێنی‌و مەلا شێخ عومەری قەرەداغی لەسەرەتای ئەو کتێبە مەشهورەی ئەو رۆژگارەدا تۆمارکردووەو بە جیهانی ئیسلامی ناساندوون، بە زەقی ئەو هەستە (تراثیة) نەتەوایەتیەی تێدا بەدی دەکرێت. هەر لە گەنجیەتیەوە هەوڵی کۆکردنەوەی کتێبی دەستنووس‌و بەرهەمی شاعیرانی کوردی داوە، چەند جارێکیش بە فەرمی داوای لە کاربەدەستان کردووە کە کتێبخانەی گشتی لە سلێمانی بکرێتەوەو هەموو کتێب‌و دەستنووسی سلێمانی و دەوروبەری تێدا کۆبکرێتەوەو بپارێزرێن.

جا کە ساڵی ١٩٧٨ بە رەسمی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی لە سلێمانی کرایەوەو بەرپرسیاریەتی کتێبخانەکەش بە من سپێردرا بوو، لەم کەناڵەوە لەگەڵ مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵدا پەیوەندییم بەهێز بوو، بە تایبەتی کە ئێمە لیژنەیەکمان هەبوو بۆ کڕینی کتێب‌و دەستنووس‌و مامۆستا سەرۆکی لیژنەکە بوو، زۆریشی بەندە خۆشدەویست‌و هەڵیدەنام بۆ توێژینەوەو نووسین، بەم بۆنەوە من لەگەڵ مامۆستای خاڵ ئاشنا بووم.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ چۆن هۆگری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە بووە؟ ئایا لە پێش خاڵدا لە کوردستان کەسی دیکە ئاگاداری ئەدەبیاتو بیرکردنەوەی ئەو قوتابخانەیە بووە؟**

مامۆستا مەحموود: مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ بە کاریگەری شێخ ئەمینی خاڵ لەسەریو کاریگەریی مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی کە مامۆستای بووە لەسەرەتای گەنجیو فەقێیەتیدا مەشرەب صۆفی بووەو ویستویەتی جێگای شێخ ئەمینی باپیری بگرێتەوە، بەڵام پاش ئەوەی کە لەسەر دژایەتی نێوان ئەو صۆفیانەی سەر بە تەکیەی شێخ عەلائەددینی بیارە لەلایەکو شێخ حسامەددین لەلایەکی دیکەوە، مجەورێکی مزگەوتی خانەقا قسەیەکی ناشرین بە شێخ حسامەددین دەڵێ، کە ئەم شێخە ئەوکاتە پیری رۆحی شێخی خاڵ بووە، پێی ناخۆش دەبێ، بۆیە لەگەڵ شێخ ئەحمەد و شێخ مستەفای برای دا لە کۆڵانی خانەقا کابرای مجێوری جنێودەر نیوە مردوو دەکەن، ئەوەندەی لێدەدەن تا وا هەست دەکەن مردووە، ئەمجا هەڵدێن، براکانی لە سلێمانی خۆ دەشێرنەوەو مامۆستای خاڵ خۆیشی دەچێت بۆ خزمەت مەلای گەورەی کۆیە (مەلا محەممەدی جەلیزادە)، لەوێ جێگەی خوێندنی دەستدەکەوێت، هەڵبەتە مەلای گەورە پیاوێکی ڕۆشنفکرو بەرچاو روون بووە، پەیوەندی لەگەڵ زاناکانی بەغداو موسڵو حیجازو ئەزهەرو شوێنی دیکەیش بەهێز بووە، زۆر گۆڤارو رۆژنامەی ئەو سەردەمەی بۆ هاتوون و لە ڕێیانەوە ئاگاداری بارودۆخی سیاسەت و

جموجوڵی زانایانی وەکو جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدەو محەممەد رەشید رەزا بووە، موناقەشەو موجادەلەی ناو پەرلەمانی عێراق و کۆڕوکۆمەڵی زانایانی زۆر دیوە. بۆخۆیشی لە بنەماڵەیەکی مەلا زادەو بەناوبانگی کوردستان بووە، ئا لەم کەناڵەوە شێخ محەممەدی خاڵ بیری صۆفیەتی وەلاناوەو ڕووی لەو نوێگەرییە کردووە کە کۆمەڵێك لە زانایانی ئەزهەرو رۆشنبیرانی میسر داهێنەرو رابەری بوو.

**د. ئاراس: لە چ ڕێگەیەکەوە ئەدەبیات و بڵاوکراوەکانی قوتابخانەی ئیسلاح گەیشتووەتە کوردستان؟**

مامۆستا مەحموود: هەڵبەتە مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ دوای ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی، بووەتە قازیی شەرعی، لە موسڵ و چەمچەماڵ و هەڵەبجە وەزیفەی قازییەتی بینیوەو دوایی لە سلێمانی، کتێب و گۆڤارو رۆژنامەی میسرییش بە ئاسانی گەیشتوونە بەغدادو موسڵ ، دەستکەوتنیان ئاسان بووە، بەتایبەتی گۆڤاری (الرسالة) و (الثقافة) کە مامۆستا شێخ محەممەد ژمارە بە ژمارە بۆی هاتوونو خوێندونییەوەو لێیان بەهرەمەند بووە، نووسینی تەفسیرەکەشی کاریگەریی قوتابخانەی (محمد عبده)ی پێوە دیارەو پڕاو پڕ لە تەفسیری مەراغی وەرگرتووە، شێخ مستەفای مەراغیش یەکێك بووە لە قوتابیانی قوتابخانەکەی محەممەد عەبدە.

**د. ئاراس: ئایا شێخی خاڵ هەوڵی نوێکردنەوەی بیری ئایینی داوە؟**

مامۆستا مەحموود: دەبێ هەوڵی دابێ، بەڵام وادیارە هەوڵەکەی سنووردار بووە.

**د. ئاراس: ئایا لە پێش خاڵدا کەسی دیکە هەبووە هەوڵی نوێگەری ئایینی بدات لە کوردستان؟**

مامۆستا مەحموود: وەکو مامۆستا مەسعود محەممەد دەفەرموێ: یەکەم کەسێك لە دوای رووخانی ئەمارەتی سۆران‌و بابان کە بە نوێخواز ناوی دەرکردبێت مەلای ئیبنو ئادەم بووە. دەڵێن "حاجی قادری کۆییش ئەو نوێخوازییە لە ئیبنوئادەم فێر بووە، مەلا محەممەدی جەلیزادەش لەو مەدرەسەیە ترووسکایی ئەم نوێگەرییەی پێگەیشتووە".

هەڵبەتە رۆنیشتنی (محمد علی پاشا) لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی میسر و دژایەتییکردنی بۆ خەلافەتی عوسمانی‌و ناردنی کۆمەڵێك لە قوتابیانی زانکۆی ئەزهەر بۆ فەرەنساو گەڕانەوەیان بە سەرکەوتووی و هەوڵدانی بەریتانیای داگیرکەر بۆ دەستخستنە نێو زانکۆی ئەزهەر بە ناوی چاکسازیی لە ئایینی ئیسلامدا (بە حەق، یان بە ناحەق) نوێخوازییەکی ئایینی لە ناو ئەزهەردا لێکەوتەوە، کۆمەڵێك لە مامۆستا پایە بەرزەکانی ئەزهەر کەوتنەگەڵ ئەو شەپۆلەو گۆڤارو رۆژنامەی سەر بەو تەیارە سەریان هەڵداو بڵاوبوونەوە، شتێکی حەتمی و حاشاهەڵنەگریشە کە ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانە گەیشتوونە کوردستان‌وکەوتوونە بەر دیدی مەلاکان‌و کاریگەری خۆیان لەسەر جێهێشتوون‌و دەیانی وەکو مامۆستا مەلا محەممەدی

گەرمیانیو مەلا یوسفی گڵێجاڕی، ئاسۆی بیرو هۆشیان پێکراوەتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ سەرچاوەی نوێخوازییو ڕۆشنبیری ئیسلامییو چاکسازییو تازەکردنەوە لە هەندێ بیرو بۆچوونی ئایینی لە کوردستاندا مەدرەسەی مەلا محەممەدی جەلیزادەی کۆیە بووە، ئەوەش بەهۆی بۆ ڕەخسانی چەند شتێك کە بۆ ئەو رەخساوەو بۆ کەسانی دیکە وا نەڕەخساوە:

١- لە بنەماڵەیەکی مەشهوری کوردستان بووە.

٢- بۆ خۆی وێڕای زیرەکیو لێهاتوویی بەرچاو، ئەندامی پەرلەمانی عێراق بووە.

٣- دۆستایەتی پتەوی لەگەڵ سیاسەتمەداری میسر ی سەعد زەغلولو مستەفا مەنفەلوتی و هاوشێوەکانیان هەبووە.

٤- دژایەتییەکی بەرچاوی خەلافەی عوسمانی کردووەو بە داگیرکەری زانیون، لەم کەناڵانەوە لەگەڵ میسر ییەکان دۆستایەتی پتەوی پەیدا کردووە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ زیاتر تەفسیرەکەی (تەفسیری خاڵ) لەسەر چ ڕێبازو مەنهەجێك نووسیووە؟**

مامۆستا مەحموود: تەفسیری مامۆستای خاڵ لە سەر ڕێبازی شێخ محەممەد عەبدە نووسراوەو لە سەدا هەشتای لە تەفسیری مەنارو مەراغی وەرگیراوە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ ڕای چۆن بووە لەسەر تەصەوف و تەریقەت؟ ئایا پەیوەندی بە تەصەوفەوە هەبووە؟**

مامۆستا مەحموود: مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ بە فەقێیەتی صۆفی بووە، بەڵام کە چووەتە خزمەت مەلای گەورە بیروڕای صۆفیزمی کاڵبووەتەوەو وازی لەو ڕێبازە هێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەروکاری مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدی کردووە، وەکو ناوەندێکی صۆفیگەریی، بەڵام دووراودوور، نەك لە نزیکەوە.

**د. ئاراس: ئایا ڕاستە دەڵێن: "شێخی خاڵ لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر فیقهو ڕێبازی ئیمامی شافیعی پەروەردە بووە، بەڵام دوای چووەتە سەر مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفە"؟**

مامۆستا مەحموود: شێخی خاڵ شافیعی مەزهەب بووە، بەڵام بە حوکمی وەزیفەی قازیەتی، شارەزایی زۆری لە فیقهی حەنەفیدا هەبووەو بەگوێرەی مەزهەبی شافیعی مەراسیمی ئایینی جومعەو جەماعەتی بەجێهێناوە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ بۆ زیاتر لەگەڵ نووسەران و ڕۆشنبیران پەیوەندی هەبووەو کەمتر لەگەڵ مەلاو ناوەندە ئایینییەکان؟**

مامۆستا مەحموود: بەڕاستی دابڕانی شێخ محەممەدی خاڵ لە مەلاو ناوەندە ئایینییەکان گرنگیینەدانی بە پێڕی مەلاو مزگەوت هەڵەیەکی گەورەی ئەو زاتە بووە، دەبوایە پێشڕەوی مامۆستایانی مزگەوتی بکردایە، نەك خۆی لێیان دابڕێ، هەر ئەوەشە بووەتە هۆی ئەوەی کاریگەری لەسەر مەلاو فەقێ کەم بێت!

**د. ئاراس: بەڕێزتان وەك ئەوەی خاوەنی تەفسیری قورئانی پیرۆزن بە کوردی، چۆن تەفسیری خاڵ هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا مەحموود: تەفسیری مامۆستای خاڵ شاکارەو تا بڵێی بە زمانێکی ڕەوانو کوردییەکی ڕەسەن نووسراوە، بەڵام داخەکەم تەواو نەکراوەو (٢٣) جزمی ماوە بنووسرێت، واتە ئەو حەوت جزمی نووسیوە، ئەگەر بێتو تەواوی بکردایە لەناو تەفسیرە کوردییەکاندا پلەی یەکەمی دەبوو، بەڵام شتێك هەیە بۆ مێژوو دەبێت بزاندرێ، نووسینەکانی مامۆستا ـ بە تایبەتی کوردییەکانی ـ بە هاوکاری و ڕێکخستنو گۆڕینو پێداچوونەوەی مامۆستا مەلا محەممەد، مەلا مستەفای کوردی بووە، ڕۆڵی ئەوی زۆر تێدایەو باسی نەکراوە.

**مەحموود ئەحمەد محەممەد**

**٢٠١٠ :٢٧:٩**

## دیمانەی دووەم

# دیداری بەڕێز مامۆستا نووری فارس حەمەخان

بەڕێز، مامۆستا نوری فارس سالآنێك فەقێ و قوتابی مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ بووە، ئاگاداری زۆر لایەنی ژیان‌و کاروانی زانستی‌و رۆشنبیری‌و بیرکردنەوەیەتی. ئایا مامۆستا بیرکردنەوەو ژیانی زانستیی چۆن بووەو ڕای چی بووە لە سەر رەوشی زانست‌و خوێندن‌و پرۆگرامی خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا، چۆن و بۆچی کەوتووەتە ژێرکاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەددینی ئەفغانی‌و شێخ محەممەد عەبدەو هاوڕێبازەکانیان؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە و زۆر گۆشە و لایەنی دیکەی نادیاری ژیانی شێخی خاڵ، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا..

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا نووری، پێوەندی بەڕێزتان و شێخی خاڵ چۆن بووە؟**

مامۆستا نوری: من بە منداڵی، لە حوجرەی منداڵان، جزمی (عمَّ)ە ی مامۆستای خاڵم خوێند، کە بە کوردی بوو، وا دەزانم کە حەپسەخانی نەقیب لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤٣دا، لەگەڵ چەند کتێبێکی وردیلەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمدا، لەسەر حسێبی خۆی چاپی کردبوون و بەسەر منداڵاندا بەخۆڕایی دابەشی دەکردن، لەو ڕۆژەوە ئاواتم بوو کە بە خزمەتی شێخی خاڵ و مامۆستای مودەڕڕیس بگەم.

کاتێك چوومە فەقێیەتی، موتابەعەی شێخی خاڵم دەکرد، هی وتارەکانی، کە لە بۆنەکاندا دەیدا، وەك بۆنەی ئیجازەی فەقێ و مەولوود و ئەوانی تریش، کە زۆرینەی کات لە مزگەوتی گەورە ئەو ئاهەنگانە ساز دەکران، وەك نووسینەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژ و ژین و ڕۆژی نوێ و ئەوانی دیکەیش، وەك کتێبەکانی، بە تایبەتی فەرهەنگەکەی و تەفسیرەکەی.... ئەو سەردەمە مامۆستای خاڵ ناسراوترین و کاراترین وتارخوێن و نووسەرو ئەدیب و کەسایەتی بوو لە سلێمانی و لە کوردستاندا.

کەسایەتی ئایینی، عیلمی، حکومی، ناوەوەو دەرەوەی عێراق، لە دوورو نزیکەوە پەیوەندییان پێوەی دەکرد، کە دەگەیشتنە سلێمانی، یەکەم هەوارگەیان لای شێخی خاڵ بوو. وەك ئەمجەد زەهاوی و صەواف و مەلا محەممەدی قزڵجی و عەلائەدین سەجادی و زۆرینەی ڕوئەسای وەحەداتە ئیدارییەکان، وەك متەصەڕیف، قایمقام، حاکمەکان، ئاغاکان، مەلاکان، شێخانی تەریقەت، مەلای میسر ی زائر.

من له پۆلی سێی فەقێیەتیەوە هەتا پۆلی هەشت، هەموو ساڵێك، لەبەردەم (مجلس علمي)دا، بە سەرۆکایەتی شێخی خاڵ ئیمتیحانم لە عیلمە دینییەکاندا دەدا، بە سەرکەوتوویی.

زۆرینەی کات لە هۆدەی تایبەتی خۆی، لە مزگەوتەکەی خۆیان، لە پاش عەسران، دادەنیشت بۆ پێشوازی، خەڵکێکی زۆر لە مەلاو فەقێو میوانو کەسەبە، لە عاشقانی مەجلیسی خاڵ دەچوون بۆ خزمەتی، ئەویش پێشوازییەکی موناسبی لێدەکردنو دەستدەکرا بە باسو هەواڵی دینو دنیای ئەو رۆژگارەیان، شێخ خۆی بەشداری لە قسەو گوفتوگۆکاندا دەکرد، شوێنە سەختەکانی کتێبە گەورەکانیان تاوتوێ دەکرد، بە تایبەتی بابەتی ئەدەبی کوردی. من زۆر زۆر حەزم لەم کۆڕانەی شێخ بوو، لەگەڵ چەند فەقێیەکی دیکەدا، وەك ڕەئوف ئالانی، حەمەی شیرین و هادی مفتی و کەسانی دیکەیش، بە گەرمی هاموشۆی ئێوارە دانیشتنانی خاڵمان دەکرد، ئەگەر ڕەمەزان بوایە نوێژی تەراویحمان لە پشتەوە زۆرترین کات لە هۆدەکەی خۆی، لە مزگەوتەکەی خۆیان دەکرد، چونکە زۆر دەنگی خۆش بوو، بە مەقامو نقامێکی دڵگیر قورئانی دەخوێند.

کورتو پوخت: بە مرووری زەمان، شێخی خاڵ ئێمەی بە فەقێی خۆی دادەنا، لەبەر ئەوە زۆرینەی کات خزمەتی میوانەکان دەکەوتە سەرشانی ئێمە و ئەوەیش لەوە باشتر بوو کە لەبەر زۆری میوان جێگەی دانیشتنمان دەست نەکەوێت.

ئەوکاتیش کە مامۆستا مەلا کەریمی بیارە، لە مزگەوتی حاجی حان بوو، هەموو پاش عەسرانێك منو فەقێ هادی، کە کوڕی موفتی سنە بوو، برای

ماموٚستا ئەحمەدی مفتی زادە بوو، دەچووین بۆ خزمەتی خاڵ، ئورجوزەکەی شێخ مارفمان لە خزمەتدا دەخوێند کە باسی عەروزە، بە نزیکەی شەش مانگ تەواومان کرد، دیار بوو شێخی خاڵ مەبەستی ڕێزلێنان بوو لە هادی کە کوڕی موفتی سنە بوو، منیش لەگەڵ هادیدا وەك براو لەگەڵ خاڵ دا وەك شێخ و دەروێش، وابووین.

ئیتر ئەم پەیوەندییەم لەگەڵ شێخی خاڵدا بەردەوام بوو هەتا کاتی مردن، زۆر شتم لەم بارەوە لە یادە کە لەم کورتەیەدا جێگەی نابێتەوە، جارێك کۆمەڵێك مەلای باش‌و خاڵ کە مەلا صالحی تریفەیان تیادا بوو، گفتوگۆ لە عیلمی بەلاغەدا لەسەر ئەمە بوو: کەسێك بە کەسێك بڵێ: (گوو بخۆ)، یان، پێی بڵێ (گوو مەخۆ) ئەم دوو جمێنە کامیان ڕەوانبێژترو بەلیغترن؟! لە دوای حەفتەیەك لێکۆڵینەوە بڕیاریاندا: دووەم بەلیغترە، چونکە گوو خواردن مسۆگەرە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ چۆن هۆگری قوتابخانەی ئیسلاحی جمالەددینی ئەفغانی‌و شێخ محەممەد عەبدە بووە؟ ئایا لە پێش خاڵدا لە کوردستان کەسی دیکە ئاگاداری ئەدەبیات‌و بیرکردنەوەی ئەو قوتابخانەیە بووە؟**

ماموٚستا نوری: بە زەینم، ئەمەی من عەرزتان دەکەم لەوانەیە باشترین هۆکار بێ بۆ ئەم وەڵامە: لە ماموٚستاکانی خۆمم بیستووە، بە تایبەتی لە ماموٚستا مەلا عەبدوڵلا چڕوستانی، کە دەیانفەرموو: کاتێ فەقێ بووین لە خزمەت ماموٚستا شێخ عومەری قەرەداغی دا، زۆر جار بە ئێمەی دەفەرموو: من گومانم هەیە لە ئیمانی شێخ محەممەدی خاڵدا، چونکە ئەوەندە بێباوەڕە بەم کتێبانەی ئێمەو ئەوەندە نوێخوازەو حەزی لە شتی تازەیە.

ئەمە لەلایێ، وەك تریش بێگومان، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیی، پەیوەندییەکی گەرموگوڕ لە نێوان ئەزهەرو میسر و مەلاو زانایانی کورد و کوردستاندا بووە، بە تایبەتی بە هۆی (رواق الأکراد)ەوە کە لە ئەزهەر بووە، کە شێخ عومەر وەجدی کوردی، سەرۆکی بووە!، بە تایبەتی تر لە رێگەی بلیمەتی کورد (فرج الله ذكي الكوردي) کە خاوەنی چاپخانەی (مطبعة السعادة) بووە لە قاهیرە، کە لەوێوە پەیتا پەیتا پەیوەندی بە مەلا و رۆشنبیرانی کوردەوە کردووە، بە بەرهەمەکانیان بنێرن بۆی، هەتا لە چاپخانەکەی خۆی چاپیان بکاو بەرهەمە چاپکراوەکانی خۆشی ناردوە بۆیان کە ساغی بکەنەوە، لەگەڵ زۆر سەرچاوەی رۆشنبیری دیکەدا، ئەوانیش ئەو کتێبانەی بۆیان ناردووە، هەموویان بەرهەمی زانایانی کوردن، کە لەلایەن مەلا ڕەسوڵی تەلانییەوە ئامادە کراون بۆ چاپ، ئەم مەلا ڕەسوڵە فەقێی (إبن القرداغي)و هاوڕێی گیانی بە گیانی خاڵ بووە تا کۆچی دوایی کردووە:

١- تهذيب الكلام.
٢- گەلەنبەوی بورهان.
٣- گەلەنبەوی ئاداب.
٤- المقولات لإبن القرداغي.
٥- تصريف الملا علي.

ئەم کتێبانە حاشیەی (مدونة)ی ئیبنولقەرداغیو پێنجوێنیو قزڵجییان لەسەرە، کە مەلای هاوسەردەمی شێخی خاڵ بوون، زۆرینەی ئەم کتێبانە مامۆستا مەلا رەسوڵی تەلانی سەرپەرشتی لە چاپدانیانی کردووە، بە نموونە لە بەرگی کۆمەڵێ کتێب کە هی ابن القرداغی و زاناکانی دیکەی کوردن وەك مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی، ئەمە نووسراوە:

أ- الطبعة الأولى في سنة ١٣٥٣هـ بمعرفة الفقير إليه فرج الله ذكي الكوردي، مطبعة السعادة بمصر.

ب- له ترجمەی (مؤلف)دا که ئیبنولقەرەداغییه ئەمه نووسراوە: حرره في سنة (١٣٥٢هـ) أفقر الى عفو ربه الصمداني محمد رسول الشهير بالتلاني.

کەواتە ئەنجامی ئەم کۆمەڵە زانیارییانە ئەوەیە کە شێخ محەممەدی خاڵ هەر بە گەنجی لە فەقێیەتیدا، لە ڕێگەی زۆر سەرچاوەوە بیروباوەڕی ئیسلاحییەکانی میسری پێگەیشتووەو موعجەب بووە پێیان، بێزار بووە لە درۆو دەلەسە و ئیسرائیلیاتەکانی نێو (دقائق الأخبار) و (تفسير الخازن) و (العصفورية) و (نزهة الناظرين)، کە بووبوون بە پەردەیە لە سەر دڵو چاوی زۆرینەی کۆلکە مەلاکانی کوردستان، تەنانەت زانا گەورەکانیش لە بەر مەشغەڵەتی (منطق)و حکمەتو فەلسەفەی یۆنانو درۆ و دەلەسەی ناو کتێبانو ڕێگەپێنەدانی میریی نەیاندەپەرژایە سەر بیرکردنەوە لە ئیسلاحی ئەحواڵی میللەت، بەم بۆنەیەوە، من بە خزمەتی مامۆستا مەلا ڕەسوڵی تەلانی گەیشتووم، کە مەلیك مەحموودی یادنەمر کردبووی بە مەلای سەرگەڵوو هەتا بە دانایی خۆی چارەسەری کێشەی هەقەکان بکات، لە مامۆستاکانمم بیستووە کە مەلای تەلانی بە گەنجی زۆر قۆز بووەو زۆر دەنگی خۆش بووە، زۆر وریا و زرنگ بووە، لە خزمەت ئیبن قەرەداغیو شێخ بابا عەلی تەکیەیی و مەلا حسێنی پیسکەندی دا، دەچوون بۆ سەر ئاهەنگی مەولوودو شتی وا، هەتا بۆ گوندەکانی دەوروبەری سلێمانیش، مەلا ڕەسوڵ بە دەنگە زوڵاڵەکەی مەدائحو قەصیدەی بوردیەو مەولودنامەی دەخوێندەوەو مامۆستاکانیش گوێیان بۆ شل دەکردو گەلێ جار دەگریان.

ئەوەشمان لە یاد نەچیٚ، کە شێخی خاڵ فەقێی مەلای گەورە بووە، مەلای گەورەش زۆر موعجیب بووە بە شێخ محەممەد عەبدەو بە مجەدیدی میسری ناوزەدی دەکات (بڕوانە: تەفسیرەکەی بەرگی ١٠ ل ٦٦٣) لە تەفسیری محەممەد رەشید رەزا نەقڵ دەکات (بەرگی ١٠ ل ١٩٥) کە پوختەی فکری ئیسلاحە.

رۆڵی رادیۆو رۆژنامەو کتێبو تەفسیرو گۆڤاریش فەرامۆش نەکەین کە لە چلەکانی سەدەی رابردوو بە دواوە زۆر کاریگەر بوون و بە ئاسانی بە دەستی هەموو کەسێك گەیشتوون، زۆر لە زاناو مەلاکانی کوردستان موتەئەسیر بوون پێیان، وەك عەلائەددین سەجادیو مەلا مستەفای سەفوەت و پیرەمێردو مەلای کۆیەو زۆر لە شاعیرەکان، بە تایبەتی مەلا رەشید بەگی بابان، کە لە چلەکاندا خەریکی نووسین بووە بە کوردیو نەحوی کوردی داناوەو بوخاریو موسلیمی کردووە بە کوردیو مەلزەمە مەلزەمە بە بەریدا ناردوویەتی بۆ مەلا حسێنی پیسکەندی، لە ئەستەموڵەوە ناردوویەتی.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ رای چۆن بووە لەسەر قوتابخانەی ئیسلاحی ئیسلامی شێخ محەممەد عەبدە؟**

مامۆستا نوری: زۆر موعجیب بووە بە قوتابخانەی ئەزهەرو بە تایبەتی بە هەوڵە ئیسلاحییەکانی جمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە، لە نووسینەکانیدا بەڵگەی ئەمە زۆر زۆرە بە تایبەت نووسینە ئایینییەکانی.

**د. ئاراس: ئایا شێخی خاڵ هەوڵی نوێکردنەوەی بیری ئایینی لە کوردستان داوە؟ لە پێش شێخی خاڵدا کەسی دیکە هەبووە هەوڵی نوێگەریی بدات؟**

مامۆستا نوری: بە شێوەیەکی گشتی (توفیق) لە نێوانی مەزهەبەکاندا باو بووە، لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە هەتا ئێستاش لە عێراقدا، لە بەشی سووننەکەیدا، مەزهەبی حەنەفی مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت بووە، وە مەلاکان لە فەتواکانیاندا کە بەدەستی ئێمە گەیشتووە بە ناوی تەقلیدەوە کاریان بە زۆر بابەتی فیقهی لە حەنەفی و مالیکیدا کردووە، ئاگایان لە را نوێخوازەکانی ئیبنوتەیمیەش بووە.

وەکی تریش بەڕاستی ئەم نەهزە دینیو قەومیو ئیسلاحییەی کە لە عێراق و کوردستاندا بەرپا بووە، بەرهەمی کۆششی کۆمەڵێك رۆشنبیری هەمەجۆر بووە، کە زۆربەیان سەربازی نەناسو سەردەمی خۆیان بوون، خاڵ لەم بوارەدا خۆشبەختانە پشکی شێری بەرکەوتووە لە کوردستاندا.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ زیاتر تەفسیرەکەی (تەفسیری خاڵ) لەسەر چ ڕێبازو مەنهەجێك نووسیوە؟**

مامۆستا نوری: تەفسیری خاڵ زۆر کاریگەری تەفسیری قاسمی و مەنناری شێخ محەممەد رەشید رەزای پێوە دیارە، کە فەقێی شێخ محەممەد عەبدە بووە، بگرە وەك تەرجەمەی پوختەی ئەو دوو تەفسیرە وایە.

**د. ئاراس: مامۆستا خاڵ رای چۆن بووە لەسەر خوێندن و مەنهەجی حوجرەکانی کوردستان، ئایا هەوڵی گۆڕینی مەنهەج و پڕۆگرامی حوجرەکانی داوە؟ ئەگەر هەوڵیداوە بۆ هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبووە؟**

مامۆستا نوری: بەڵێ هەوڵی دەدا، بەڵام ئاستەنگ زۆر بوو، زۆر لە مەلاکان ناڕازی (معارض) بوون، خاڵیش هێمن و سەلارو لەسەرخۆ بوو، حەزی لە شەڕە قۆچ و ململانێ نەبوو، زۆرتر بە نووسین ئەو هەوڵەی دووپاتدەکردەوە، وەکی دیکەیش، خاڵ لەو بەرنامە کۆنە ڕزیوە کە لە حوجرەکاندا پیادە دەکرا زۆر بێزار بوو، بەڵام بەهۆی نائارامی لە ناوچەکەدا، هەموو هەوڵێکی ئیسلاحیی بە وێرانکەر (هدَّام) دادەنرا، لەبەر ئەوە هەوڵەکان زۆر سەرەتایی‌و سست بوون‌و درەنگ گەڵاڵە بوون، ئێمە کە فەقێ بووین هەوڵمان دەدا مەنهەج بگۆڕێت‌و مەدرەسەمان بۆ بکرێتەوە، یەکەم کەس کە هانامان بۆ دەبرد شێخی خاڵ بوو، یەکەم (معارض) مەلا مستەفای سەفوەت بوو، گوایە شتی وا قەزا بەسەر دراسەی دینییدا دەکات.

د. ئاراس: شێخی خاڵ بۆ نەیتوانیوە کۆمەڵێك مەلای رۆشنبیری وەك خۆی پێبگەیەنێت لەگەڵ ئەوەدا مزگەوت‌و حوجرەیان هەبووە؟ بیری شێخی خاڵ بۆ کاریگەریی لەسەر مەلا و ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان نەبووە؟

مامۆستا نوری: هەر مەلایەکی رۆشنبیر دەبینی لەم سەردەمەدا، دەستنێژی دەستی شێخی خاڵە، کاریگەری نووسینەکانی خاڵ لەسەری کردوویەتی بە رۆشنبیر، بەڵام مەلاکانی سەردەمی خاڵ، وا لە پەل و پۆ کەوتبوون و بیروباوەڕی ناو کتێبە کۆنە تەقلیدیەکان وا پڕی کردبوون، بە عیسا و بە مەهدی مونتەزیریش وریا نەدەکرانەوە، گەرچی کەمە کەمە مەلای رۆشنبیرو بلیمەتیان تیا هەڵکەوتووە، وەك خەتیب و مدرس مەلای گەورەو بابان و.. هتد.

بەشێوەیەکی گشتی، دوو بەڵا، مەلا و زانا و شاعیرانی کوردستانی ئیفلیج کردبوو: مەدرەسەی تەصەوفی وشکی دوور لە تەصەوف، ئیقتاع و دەرەبەگ.

**د. ئاراس: ئایا مامۆستا خاڵ وەك کەسێکی نوێخوازو بیرکراوە، چۆن لە رەوشی مەلاکانو داخران و دابڕانیان لە ناوەندە رۆشنبیرییەکان بە شێوەیەکی گشتی و گیرخواردنی ئاستی تێگەیشتنیان لە بازنەیەکی مەزهەبی داخراودا بۆ ئایین، روانیوە؟**

مامۆستا نوری: لە ڕاستیدا نابێ ئێمە هەموو شتێ بە پێوەری سەردەمی خۆمان بپێوین، چونکە زۆر لە کێشەکان کە لە کوردستاندا دروست بووبوون میری خۆی کە داگیرکەر (محتل) بوو دروستی دەکرد، هەرکەسێ جگە لە خۆی هەوڵی رۆشنبیرکردنو حزبایەتیو چکسازیی (تثقیف) و (تحزب) و (إصلاح) و گۆڕانو نوێخوازی بکردایە بە تێکدەر (مخرب) دادەنراو مولاحەقە دەکرا، وەکی تریش خاڵ ورووژێنەر نەبوو، بڕوای وا بوو ئەوەی بە (موعظة حسنة) دەستدەکەوێ، بە شەڕە دەم دەستناکەوێ، لەبەر ئەوە هەمیشە دۆستی لایەنە دینییەکان بوو، مەلاکانی زۆر دەلاواندو رێزی مەزهەبەکانی دەگرتن، هەر هیچ نەبێ هەتا موقاتەعەی خۆی نەکەن، وەکی تریش پابەند بوون بە مەزهەب با بگاتە راددەی تەزەموتیش زۆر باشترە لەم پاشاگەردانییەی ئەمڕۆ، کە بە ژمارەی نوێژکەرەکان مەزهەبی نوێ پەیدا بووەو هەمووشیان یەکتری بە کافر دەزانن!

کورتو پوخت: سەرچاوەی هەموو کێشەکان لە کوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ بێ کیانی، تۆ کە کیانێك، دەوڵەتێك، قەوارەیەکت نەبوو، چۆن چۆنی

دەیسەلمێنی کە تۆ هەیت، یان نیت، لەبەر بێکەسیی هەموو هەوڵێك کە لەم کوردستانەدا دەدرا بۆ پێشکەوتن‌و گۆڕان چاکسازی، میری بە دڕاندانە سەرکوتی دەکرد.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ ڕای چۆن بووە لەسەر تەصەوف‌و تەریقەت؟ ئایا پەیوەندی بە تەصەوفەوە هەبووە؟**

مامۆستا نوری: شێخی خاڵ خۆی لە بنەماڵەیەکی متەصەوف بوو، لە بەر ئەوە زۆر ڕێزی باوباپیرانی خۆی دەگرت، هەمیشە کە ناوی دەبردن دڵی گەرم دەبوو، شانازی پێوەدەکردن، لەبەر ئەوە خۆی زانایەکی گەورە بوو، پەروەردەی بەر دەستی کتێبە عومدەکانی ئوصولی فیقه بوو، زۆر بە جوانی باوەڕی بە (خاتمة التصوف)ی جمع الجوامع هەبوو، زۆر موعجیب بوو بە (أحياء علوم الدين)ی ئیمامی غەزالی، لە هەمانکاتدا پەیوەندی پتەوی لەگەڵ بنەماڵەکانی تەصەوفدا هەبوو، بە هەردوو جەناحە مەشهورەکەیەوە (نقشبندی) و(قادری)، بەڵام خۆی لەبەر وەزیفەو نووسین و باری کۆمەڵایەتی، مەودای ئەوەی نەبوو، کە تەصەوف بەرمەجە بکاو لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پیادەی بکات، بەڵام لە هەر کوێ خورافات‌و شەتەحات‌و بیری پڕوپوچ هەبوایە، خاڵ بە دەست، بە قەڵەم، بە زمان، لە دژی بوو!.

لەسەردەمی شێخی خاڵ لە مزگەوتی گەورەو خانەقای مەولانادا، زیکری قادری‌و نەقشبەندی لە پاش نوێژی جومعە دەکرا، عەلاقەی شێخی خاڵ لە گەڵیاندا زۆر دۆستانە بوو.

**د. ئاراس: ئایا ڕاستە دەڵێن: "شێخی خاڵ لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر فیقھ و ڕێبازی ئیمامی شافیعی پەروەردە بووە، بەڵام دوایی چووەتە سەر مەزھەبی ئیمام ئەبو حەنیفە"؟**

مامۆستا نوری: مجرد لەم قسەیە درۆتر نییە، شێخی خاڵ رەخنەی مامۆستاکانی سەردەمی زەھاوی لە موفتی زەھاوی بەھەند دەگرێت، کە گوایە زەھاوی لەبەر مەنصەبی ئیفتا مەزھەبی خۆی لە شافعیەوە گۆڕیوە بۆ حەنەفی، ئیتر چۆن خۆی ھەڵەی وا دەکات، من لە پاش شێخی خاڵەوە نوێژم کردووە، نەمدیوە کە موخالەفەی مەزھەبی خۆی بکات، بەیانیان قنوتی دەخوێند، قنوتی بەیانی لە حەنەفیدا نییە، دەستنوێژی لە ژن دەشۆردەوە، لە کاتی باران‌و سەفەردا جەمعی دەکرد، لەسەرەتای فاتیحەوە (بسم الله) دەخوێندو زۆر شتی دیکە کە تایبەتی مەزھەبی شافعین، بەڵام ئەوەی کە ئەم وەھمەی دروستکردووە، ئەوەیە کە مەزھەبی ڕەسمی لە مەحکەمە شەرعییەکاندا لە عێراقدا، ھەتا ئێستاش مەزھەبی ئەبوحەنیفەیە کە مەرقەدی وا لە بەغداد، دیارە قازیش کە رەئیسی مەحکەمەی شەرعی بووە، پابەندی ئەم یاسایە بووە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ بۆ زیاتر لەگەڵ نووسەران‌و رۆشنبیران پەیوەندی ھەبووەو کەمتر لەگەڵ مەلاو نێوەندە ئاینییەکان؟**

مامۆستا نوری: چونکە ئێمە بەس ئاگامان لە نووسینەکانی خاڵە، بۆیە وا گومان دەبەین، دەنا لە واقیعدا رۆژانە لە مزگەوت و لە مەحکەمەی شەرعی، لای شێخی خاڵ پڕ بوو لە فەقێ‌و لە مەلاو زانا ئاینییەکان‌و لە شێخ‌و دەروێش‌و صۆفی‌و ناوەندە ئاینییەکان، ھەتا لەماڵیشەوە ھەروەھا،

بگره شێخی خاڵو شێخ محەممەدی خەتیب، لە سەردەمی خۆیاندا پارێزەرو محامی هەموو فەقێو مەلایەك بوون كە كێشەیەكیان بوایە لەگەڵ میری، یا هی كۆمەڵایەتی! شێخی خاڵ ئەوەندە رێزی توێژی مەلای لەلابوو، هەتا مرد جبە و عەمامەی دانەنا، لە ماڵیشەوە لەبەری دەكردن، لە دائیرە لە ماڵ، لە مزگەوت، لەبەر بچووكترین فەقێ هەڵدەساو چای بۆ دەكرِیو بەرِێی دەكرد.

**د. ئاراس: بەرِێزتان چۆن تەفسیری خاڵ هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا نوری: ئەگەر گەلی كورد بەختی یار بوایە، تەفسیری خاڵ بە تەواوی تەواو دەبوو، بەڵام زێرِ هەر زێرِە، باشترین تەفسیرە، كورد فێری دوو شتی گرنگی سەرەكی دەكات: دینی رِاست و دروست و زمانی شیرینی كوردی رەسەن، نەوەك باركراو و چەقیو لە ناو هەرِگی ئەم هەمكە زاراوە بیانییانەدا، كە بەناو رۆشنبیرەكانی ئەمرِۆ برەوی پێدەدەن، كە قسە دەكەن دەڵێی ئەورووپاین و تازە بە خێر فێری كوردی دەبن!!

**د. ئاراس: محەممەدی مەلا كەریم دەڵێت مامۆستا خاڵ كەوتووەتە ژێر كاریگەری بیری قوتابخانەی محەممەدی كورِی عەبدولوەهاب، بەڵام نەیتوانیوە بەناوی ئەوەوە بۆچوونەكانیان دەربرِێت و بەناوی خۆیەوە بۆچوونەكانی ئەوی نەقڵكردووە لەم رِووەوە بەرِێزتان دەڵێن چی؟**

مامۆستا نوری: كاكە حەمە كە مامۆستام بووە، خۆی لە هەموو كەسێ باشتر دەزانێ كە خاڵ چەندێ لە تۆرانییەتی ئەتاتورك دوور بووە، دوو ئەوەندە لە وەهابیەت دوور بووە، چونكە ئەم دوو رِێبازە توندرِەوانە برِوایان بە غەیری خۆیان نییە، ئەویش لەگەڵ بیری كوردایەتیدا كە بیری خاڵی غەزو

کردبوو دژی یەکترین، ئەم بوهتانەی کاکە حەمە رەنگە لەوەوە هاتبێ کە ئەو لەلایەنی بیروباوەڕەوە زۆر دوورە لە (الأخوان المسلمین) کە ئێستا لە میسر و زۆر شوێنی دیکە سەرکردایەتی رابوونی ئیسلامی دەکەن، لەبەر ئەوە وا هەست دەکات ئەگەر خەڵك لەو فیکرەیە بتەکێنێتەوە زیاتر خێری دەگات!

**د. ئاراس: ڕای بەڕێزتان چۆنە دەربارەی شێخی خاڵ و بەرهەمەکانی چۆن دەنرخێنن؟**

مامۆستا نوری: بەڕای بەندەو بەڕای هەموو کەسێکی خاوەن ئیمانو خاوەن ویژدان، شێخی خاڵ کەسایەتییەکی کوردی رچەشکێن بوو، رۆڵی لە پێشخستنی کەلتوورو ئەدەبی کوردیدا، لە نالیو مەحویو خانیو مەلای جزیری کەمتر نەبووە، سەرمەشقو پێشەوا بوو بۆ پێشخستنی بواری ئایینی، بەڕاستی محەممەد عەبدەی کورد بوو، دۆستی دینو دنیای کوردان بوو، لەسەرانسەری ژیانیدا بۆ خێری گەلی کورد وەك مۆم دەسووتا، زۆر مەنصەبی گەورە گەورەی ڕەفز کرد، کە میری هەوڵی دەدا لەو ڕێگەیەوە دەستەمۆی بکات، خۆزگەم مامۆستا سەید عەلائەددین سەجادی زەهری بخواردایەو سەرۆکی ئەمانەتی ئەوقافی مەنتیقەی حوکمی زاتی قەبووڵ نەکردایە، وەك خاڵ ئەو بەرتیلەی قەبوڵ نەکرد.

هەتا کوردێ لە کوردستاندا مابێ، ئەم کەسایەتیە کوردانە ناویان وەك مانگ و ئەستێرە بە ئاسمانی کوردستانەوە دەدرەوشێتەوە: خاڵو پیرەمێردو مەلای مودەڕڕیسو سەجادیو ئەمین زەکی بەگو قانیعو حاجی و کەسانی دیکەی وەك خۆیان.

بەرهەمەکانی خالێ سەرچاوەن و سەرمەشقن بۆ زمان، پەندی پێشینان، ئایین، کوردایەتی و مەردایەتی و دروستکردنی مرۆڤی ڕاستو دروستو چاكو پاك بۆ دین و دنیا، دوورن لە هەموو بنەماو ڕێبازێکی تەحریفی.

چەندەم خۆش دەوێ مەلای مەردی کورد
خزمەتی کورد کا لەسەرخۆ، ورد ورد
وەك خالێ و خانی و ئاغای سەجادی
وەك نامیو حاجیو خانای قوبادی
لە خانمانیش، وەکو خانزادی
مەردانی خوا بوون، زیندوو بێ یادی!
وەك مەلیك مەحموود، مەلای بەرزانی
لە ڕەگەزی (مێ)ش، وەك حەپسە خانی!
ئەی گەلی کوردم من بە قوربانتم
ئاشق بە دین و خاك و زبانتم! !
بێ کەسی وەك من، بۆیە بێنازی
دەنا بۆ جوانی، دەڵێی نازنازی!
گەر جوانی خاك بەپێی خاك بێ
دەبێ بۆ جوانی کوردی تاك بێ.

**دڵسۆزی کوردو کوردستان**

**نوری فارس حەمەخان**

**٥:١٠:٢٠١٠**

## دیمانەی سێیەم

# دیداری بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی

بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی کەسێکی دیاری ناوەندی رۆشنبیری کوردیە، نووسینو چالاکییە ڕوناکبیرییەکانی لە نێو بزاڤی رۆشنبیری کوردیدا جێگەی ستایشە، هەر لەم ڕوانگەوە ئێمەیش بۆ ئاگاداربوون لە مێژووی پەروەردەو خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا، هەروەها کاریگەری ئەو پڕۆسەیە چی بووە لە بیرو ئەندێشەو کەسایەتی کورد؟، هاوکات دەربارەی بیری نوێخوازی و هەوڵە نوێگەرەکانی هەریەك لە حاجی قادری کۆییو مەلای گەورەو شێخ محەممەدی خاڵ کە تا چەند توانیویانە وەك نوێگەرو ئیسلاحخوازی ئایینی دەربکەون، چەند پرسیارێك ئاراستەی بەڕێزیان دەکەین.

هەر بۆ ئەم مەستە ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغیدا سازدا وەك کەسێکی ئاگاداری ئەو مێژووەو رۆشنبیرێکی ئاگاداری بزاڤی رۆشنبیری کوردی. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە بە چاوێکی رەخنەگرانە سەیری ڕەوتی مێژوو بکەین، کوێرانەو بێ بەڵگە باس لە ڕەوتی ڕوداوەکان نەکەین، گرنگیی نووسینو تۆمارکردنی مێژوو مەرج نییە هەموو کات بەدڵی ئێمە بێت، بەڵام مەرجە وەک خۆیان تۆماریان بکەین و لەگەڵ رووداوەکاندا ڕاستگۆ بین..

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی خوێندنەوەتان بۆ مێژووی خوێندن لە کوردستاندا چۆنە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: ئاسان نییە باس لە مێژووی خوێندن لە کوردستاندا بەو شێوەیە بکرێت کە سەرەتاکانو جۆری ئەو خوێندنە و دامەزراوە و ئاڕاستە و پەیوەندیی فێرکار و فێرکراو دەستنیشان بکرێت، هۆی ئەمەش، بە شێوەیەکی سەرەکی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو خوێندنە، نەك تەنها بە شێوەیەکی رێکوپێك، بەڵکو بە هیچ شێوەیەك رووناکی نەخراوەتە سەر سەرەتاکانی و سەرچاوەی باوەڕپێکراو و یەکلاکەرەوەمان بۆ ئەو مەبەستە لە بەردەستدا نییە، خەملاندنەکانی نووسەرەکانی ئەم سەردەمانەی دواییش لەبارەی هەموو ئەوانەی کە بە مێژووی نووسینو داهێنانو خوێندن لە کوردستاندا دادەنرێن، رەنگدانەوەی سۆز و خەونی نووسەرانیانو پشت بە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر نابەستن، بۆیە ناتوانم وەکو سەرچاوەی باوەڕپێکراو مامەڵەیان لەگەڵ بکەم.

بە گشتی، پێدەچێت حوجرە یەکەمین دامەزراوی خاوەن خەسڵەتو سیمای دیارییکراوی خوێندن بێت لە کوردستاندا، بەڵام نازانرێت سەرەتاکانی ئەم دامەزراوە بۆ کەی دەگەڕێتەوەو چۆن بووە؟. دووریش نییە سەرەتاکانی ئەم خوێندنە کۆپییەك، یان لاساییکردنەوەیەکی شێوازی خوێندنی کۆنی ئێرانی سەردەمی سوننیی بێت، واتە پێش ئەوەی شیعە لە ئێراندا بە تەواوی ببنە زۆرینە لە ساڵی ١٦٠٢ ز، لەسەر دەستو سەردەمی شا عەباسی یەکەمی صەفەوی (١٥٨٧ یان ١٥٨٨ ــ ١٦٢٩ز)دا.

هۆی ئەم بۆچوونە بریتییە لەوەی ئەم بونیادە (حوجرە) دواشێوەی زاڵی خوێندنە لە کوردستاندا کە دەیان زانای گەورەی وەکو بێتووشیو ئیبن ئادەمو... تاد، دەرچوواندووەو ئەمەش بەبێ بوونی بنەما و زەمینەیەکی مێژوویی پتەوی چەند سەد ساڵە نایەتەدیو هاوەزهەببوونی زۆرینەی سوننییەکانی ئەو سەردەمەی ئێران لەگەڵ کوردی لای خۆمان ( شافیعی)، هەمان رێبازی خوێندن و هەمان بواری زانستیو هەمان ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەی فەقێ بوون لە ئێرانو کوردستانی خۆماندا و رەنگدانەوەی کاریگەریی ئەو گەورە شاعیر و نووسەرانەی ئەو سەردەمانە بەسەر داهێنەرانی کوردەوە، وەکو رەنگدانەوەی گەورەی سەعدی و حافز، بە تایبەت، بەسەر (مەلای جزیری)و (مەولەوی) و (مەحوی)و.. هتد.

**د. ئاراس: وەك بەرێزتان ئاگاداربن، بیری نوێگەری ئایینی (التجدید الدینی) لەکوردستان هەبووە؟ کێ وەك یەکەم کەس هەوڵی نوێگەری داوە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: بە هۆی ناڕوونیی مێژووی خوێندن لە کوردستاندا و فرەلایەنیی چەمکی "نوێگەری" و سەختیی بڕیاردان لەوەی کێ لە چ بوارێکدا بە ڕاستی "نوێگەر" بووە، چونکە نە هەموو بەرهەمەکانی زاناکانمان چاپکراون، نە بەندەش توانای بایەخدان بە هەموو بوارەکانم هەبووەو هەیە، نە دەتوانم باس لەوەش بکەم کە تەنانەت چاوم بە بەشێکی کەمی چاپکراوەکانیشدا خشاندووە، زۆر سەختە باس لە یەکەمین کەسی کورد بکرێت کە هەوڵی نوێگەریی ئایینی دابێت، پێموایە ئەگەر چەمکە باوەکەی نوێگەریی مەبەستمان بێت، ئەوەی پشت بە فەرموودەی (إِنَّ اللهَ يبعَثُ لِهذهِ الأُمَّةِ، عَلَى رأسِ كُلِّ مَائَةِ سَنَةٍ، مَن يُجَدِّدُ لَها دينَها) دەبەستێت، ئەوا سەختە

بتوانین باس لە کەسێکی دیارییکراو بکەین، چونکە ئەم چەمکە هەمەلایەنەیەو هەردوو بواری مەعریفیو بانگەشەش بەخۆوە دەگرێت، جگە لەمەش بەلای بەندەوە زانایانی کورد، وێڕای زیرەکیی دەگمەنو رووبەری بەرینی خوێندەواریو فرەسەرچاوەیی هەندێکیان، کە بە ژمارەش زۆرن، بەڵام لە بۆچوونەکانیاندا زاڵیی بۆچوونی گەورە زانایانی ناکوردی پێش خۆیان بە روونی دیارە، لەمەش بەولاوە، پێموایە تەنانەت گەورە پێشەنگانی بێداریی ئیسلامیی وەکو تەهتاوی (رفّاعة رافع الطَهطاوي ١٨٠١ ــ ١٨٧٣ز )، ( جمال الدين الأفغاني ١٨٣٨ــ١٨٩٧ ز )، (عبد الرحمن الكواكبي ١٨٤٩ ــ ١٩٠٢ ز ) و ( محمد عبده ١٨٤٩ — ١٩٠٥ز)یش نوێگەری ئایینی نەبوون، بەڵکو ریفۆرمخوازی کۆمەڵایەتیی ئامێتەکردووی ئایینی ئیسلامو چەند چەمکێکی سیاسیی ئەورووپایی پەیوەست بە مەسەلەی ئازادی و سەربەخۆیی گەلانو رزگاری لە داگیرکەران بوون، بەڵام ئەگەر مەبەستمان لە "نوێگەریی" بۆ هەر یەکێك لە بوارەکانی نوێگەری ئایینی بێت، ئەوا بێگومان کەسێکی وەکو مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١١٩٣ ــ ١٢٤٢ ك، ١٧٧٩ ــ ١٨٢٦ ز) یەکێکە لە گەورە تازەکەرەوەکانی سۆفیزم بەگشتیو تەریقەتی نەقشبەندی بە تایبەتیو گرنگترینو بەرجەستەترین رووی نوێگەریی بریتییە لە میتۆدی (تێکەڵکردنی جەزبەی پێش سلووكو چلەکێشی) بە مەبەستی زوو پێگەیاندنی سۆفی لە سەردەمێکدا کە پێداویستیی هەمەلایەنەی ژیان بوو، بوونە رێگری گەورەی بەردەم ئەو ئەزموونە، هەر ئەو میتۆدەش بووە مایەی ئەو بڵاوبوونەوە بەرفراوانو خێرایەی نەقشبەندیی، موجەددیدی خالیدی بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خیلافەتی عوسمانیو قەوقاز و ئۆراڵو ئاسیای ناوەڕاست بە گشتی و ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**د. ئاراس: ئایا بۆ کاتو سەردەمی خۆیان، خوێندنی حوجرەکان لە ئاستی پێویستدا بوون؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: بێگومان، بەڵگەش ئەو رەوتە هەڵکشاوەی گەشەسەندنی بونیادی حوجرەیە لە کوردستاندا و بەرهەمهێنانی ئەو کەڵە زانایانەی کە رۆڵی گەورەیان لە خزمەتی ئەو بوارە زانستییانەی حوجرە بایەخی پێدەدان، هەبووە، کە هەندێکیان بواری ئایینی نەبوون، وەکو فەلسەفە و مەنتیق، حیساب، ئەستێرەناسی (فەلەك)، نەحو و صەرف و زمانی عەرەبی بە گشتی، رەوانبێژی، زمانو ئەدەبیاتی فارسیو... هتد، جگە لەو داهێنەرە گەورە و دیارانەی شیعری کوردی لە (مەلای جزیری)یەوە تا دەگاتە پاش ناوەڕاستی سەدەی رابردووش، کە خوێنەری ئەمڕۆ سەرسامە لە دڵگیریی داهێنانیانو لەبەر قووڵیی شیعرەکانیان بە ئاسایی ناتوانێ لێیان بگات، ئەمانە دەرەنجامگەلێکن چاویان لێناپۆشرێت.

**د. ئاراس: لەگەڵ ئەوەشدا لە ناو پرۆگرامی حوجرەدا فەلسەفە خوێنراوە، بەڵام بۆ نەبووەتە هۆی پەروەردەکردنی کەسانی عەقڵانی و کراوەو خەمخۆری خەمەکانی خەڵك لە کوردستاندا؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە، بەڵام ئاوەها سەرپێیی ناکرێ بڕیاری لێ بدرێت. سەرەتا دەبێ بزانرێ چ فەلسەفەیەك لە حوجرەدا خوێندراوە و جێی عەقڵانییەت، لە روانگە ئەو فەلسەفەیەوە لەکوێیە ! ؟

عەقڵانییەت، ئەگەرچی هەندێك رەگی سستی لە فەلسەفەی یۆنانیدا بەدی دەکرێت، بەڵام سەرهەڵدانی ڕاستەقینەی لە حەڤدەیەمین سەدەی

زاییني، له لایەن فەیلەسووفی گەورەی فەڕەنسا رینێ دیکارت ( Rene Descartes، ١٥٩٥ ــ ١٦٥٠ ز ) بوو، بە تایبەت پاش راگەیاندنی میتۆدە عەقڵییەکەی لە کتێبی پڕ بایەخی : (وتارێك لەبارەی میتۆدەوە)دا و دابەشکردنی فەلسەفەی پاش رێنیسانسیش بۆ سەر دوو ئاڕاستەی (ئاوەزگەرا ــ عقلی) و (ئەزموونگەرا ــ تجریبی) لە لایەن فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی (ئیمانوێل کانت Emmanuel Kant، ١٧٢٤ ــ ١٨٠٤ ز) بوو.

ئەگەرچی دیکارت لە هەموو نووسینەکانی و کتێبی ناوبراویشدا هەوڵی زۆری داوە رێزی گەورەی بۆ ئایینو "زانیاریی لە دەرەوەی رادده و توانای مرۆڤی ئایین" دەرببڕێت، بەڵام خودی میتۆدی عەقڵی مەعنای توانای بێپایانی ئاوەز (عەقڵ) لە پەی بردن بە راستی دەگەیەنێتو خودی (کۆگیتۆ)کەی دیکارتیش: "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم" نەك تەنها ئەو توانایە دەردەبڕێت، بەڵکو بوونی مرۆڤیش بەو پڕۆسەی (بیرکردنەوە)یەوە دەبەستێتەوە، کە پڕۆسەیەکی عەقڵییە، ئەم سەربەخۆییەی توانای عەقڵ لە دەرك کردن بە راستییەکان، بووە مایەی دابڕان لە چەمکە کۆنەکەی مەعریفە کە سەرچاوەکەی ئایین بوو، لێرەوە پڕۆسەی جیاکردنەوەی هەموو شتێك لە ئایین دەستپێکرد.

لە بەرانبەری ئەمەدا، ئەو فەلسەفەیەی لە حوجرەکاندا دەخوێندرا تێکەڵەیەك بوو لە مەنتیقو توێژینگە ــ مبحث ــ ی ئۆنتۆلۆژی ــ وجودی ــ لە بواری بیروباوەڕ ــ العقائد، Theologyــو فەلسەفەی پەیوەست بەم بوارەو هەندێك لە بنەماکانی سۆفیگەریی خزێنراو بۆ نێو ئەم بوارانەوە.

هێندەی پەیوەندیی بە مەنتیقو توێژینگەی ئۆنتۆلۆژی ـ بوون ـەکەوە هەیە، سەرجەمی بۆچوونەکان رەنگدانەوەی بۆچوونەکانی ئەرستۆ (Aristotle، ٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ. ز)ی ئامێتەکراو بە بۆچوونەکانی ئیبن سینا (الشیخ الرئیس أبي علي الحسین بن عبدالله بن الحسن بن علي بن سینا، ٩٨٠ ـ ١٠٣٧ ز ) و ئیبن روشد ( أبو الولید محمد بن أحمد بن محمد إبن رشد، ١١٢٦ ـ ١١٩٨ ز)ن.

شایانی باسکردنە فەیلەسووفانی پێش ئیبن روشد لە لایەن ئیمامی غەزالی (حجة الإسلام أبي حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي الطوسي، ٤٥٠ ـ ٥٠٥ ك، ١٠٥٨ ـ ١١١١ ز)یەوە لە کتێبی (تهافت الفلاسفة)دا بەرپەرچ درانەوەو لە سێ خاڵدا بە کافر و لە حەڤدە خاڵیشدا بە ئەهلی بیدعە لەقەڵەمی دان، (ئیبن روشد) لە کتێبی (تهافت التهافت)دا وەڵامی ئیمامی غەزالیی دایەوە.

لەبەر ئەوەی (حوجرە) بە گشتی لە ژێر کاریگەریی ئیمامی غەزالییدا بوو، بۆیە رەنگدانەوەی ئەمەش بەسەر ئەو فەلسەفەیەوە هەیە کە لە حوجرەدا دەگوترایەوە، کە لە بۆچوونەکانی ئەشعەری (أبو الحسن علي بن اسماعیل بن أبي بشر إسحاق، ٢٦٠ ـ ٣٢٤ ك، ٨٧٤ ـ ٩٣٦ ز) لە بواری بیروباوەڕ (العقائد)دا پەیڕەوی دەکرد، ناوبراویش پێش هەموو فەیلەسووفە موسڵمانەکان، بەڵام پاش موعتەزیلە، هەندێك لە بنەما مەنتیقییەکانی هونەری دایەلۆگو بنەماکانی توێژینگەی بوون (ئۆنتۆلۆژی)ی بۆ بەرپەرچدانەوەی بۆچوونی موعتەزیلە بەکارهێنا، تێکڕای ئەمانەش، لە

بناغەدا قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) یان بە سەرەتاگە و بناغەی ئەنجامگیرییکردن دانا بوو.

لێرەوە دەتوانین دڵنیا بین لەوەی ناکرێ باس لە (عەقڵانیییبوون)ی دەرچووانی حوجرە، بە چەمکە فەلسەفییە کۆن و تازەکەی عەقڵانییەت، بکرێت، چونکە (حوجرە) سەرلەبەر میتۆدی پشتبەستوو بە مەعریفەی ئایینیی هەڵقوڵاو لە قورئان و سوننەتی بەکاردەهێنا و ئاوەزگەرا ـ عەقڵانییەت ـ ی فەلسەفییش لەو بنەمایانە یاخی بوو.

هەڵبەت لە بناغەشدا بنەما مەعریفییەکانی ئیسلام جیاوازە لەو بنەما مەعریفییانەی مەسیحییەت کە میتۆدی عەقڵیی رۆژئاوا لێی یاخی بوو.

هێندەی پەیوەندیی بە کەسانی "کراوە" و "خەمخۆری خەڵقی کوردستان"یشەوە هەبێت لە حوجرەکانی کوردستاندا، ئەوا پێموایە بەشێکی بەرچاوی دەرچووی ئەو بونیادە هەم کراوەو هەم خەمخۆری خەڵقیش بوون، ئەگەرچی بە بۆچوونی بەندە مەرج نییە ئەوانەی بە فەلسەفە و بیری بەرزی مرۆڤایەتی گۆش دەکرێن، مەرج نییە کراوە و خەمخۆری خەڵقی بن، چونکە مەسەلەی چاکەو خراپە رەگی قووڵی لە پێکهاتەی دەروونیی مرۆڤدا هەیە، سەرجەمی ژیانی و لایەنەکانی کارکردن لە کەسایەتیی رۆڵ لەو مەسەلەیەدا دەبینن، نەك تەنها زەمینەی رۆشنبیریو ئاستی خوێندەوارییی.

**د. ئاراس: خوێندنی فەلسەفە زیاتر کەسانی عەقڵانی بیرکراوە دروست دەکات، بەڵام بەڕای بەڕێزتان خوێندنی فەلسەفە ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلاکانی کوردستان هەبووە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: بە شێوەیەکی سەرپێیی، وەڵامی ئەم پرسیارەم لە پەراوێزی وەڵامی پرسیاری پێشوودا دایەوە، گریمان فەلسەفە کەسانی عەقڵانیی بیرکراوە دروست دەکات، ئایا ڕەفتاری مرۆڤـ لە نێو کۆمەڵدا مەحەکو ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی نییە ! ؟

مارتن هایدگەر (Martin Heidegger، ١٨٨٩ ـ ١٩٧٦)ی فەیلەسووفی ئەڵمانی ڕەنگە تەنها فەیلەسووفی زۆر گەورەی سەدەی ڕابردوو بێت کە ناوی لە نێو هەموو ئاڕاستە فەلسەفییە جۆربەجۆرەکانی ئەو سەدەیەدا هەیە، ڕەنگە دوا فەیلەسووفیش بێت کە فەلسەفەیەکی هەمەلایەنگیری هەبووە، ئەم پیاوە ماوەیەك ئەندامی حزبی نازیی ئەڵمانیا بووە، خۆیشی ددانی بەوەدا ناوە، ئەگەرچی گلەیی کردووە لەوەی ئەو مەسەلەیەی لێ گەورە کراوە، نەشیدەزانی ئەو حزبە بەو ئاڕاستە ترسناکە دەڕوات، بەڵام چەندین نووسەری بەناوبانگی وەکو (کارل لۆڤیچ)، لە گۆڤاری بەنێوبانگی (سەردەمە تازەکان)ی فەرەنسا لەساڵی ١٩٦٤ و جان پییێر ڤای لە کتێبی (فەلسەفەی هایدگەر و نازییەت) لە ساڵی ١٩٨٧دا و نووسەری چیلی (ڤیکتۆر ڤاریاس) لە کتێبی (هایدگەر و نازییەت) کە پێشەکیی وەرگێڕانە ئەڵمانییەکەی ئەم کتێبە لە لایەن (یۆرگن هابەرماز Jurgen Habermas)ەوە نووسرا، ئەو تۆمەتەیان بە ڕادەیەکی ترسناك لێ گەورە کردەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٧دا کتێبی (هایگەر بە هەموو

تواناوه) له لایەن فرانسوا ڤیدییّو کۆمەڵێك توێژەری گەورەوە دەربکرێت بە مەبەستی پووچەڵکردنەوەی تۆمەتە ئاڕاستەکراوەکان بۆ هایگەر.

هەرچۆنێك بێت، بە ئەندامبوونی حزبیش لە فەیلەسووف ناوەشێتەوە، بەڵام ئەوە هایدگەر وا بوو، (جان پۆل سارتەر)ی گەورە فەیلەسووفی ئێکزیستێنتیالێزم ـ وجوودییەت ـ سەردەمێك ئەندامی حزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا بوو، پاشان لێی دوورکەوتەوەو شانۆنامەی (دەستە گڵاوەکان)ی دژی ڕەفتاری سیاسیی نابەجێی سەرانی ئەو حزبە نووسی.

(ڕۆژیێ گاروودی)یش کۆمۆنیست بوو، لەو سەنگەرەوە دژایەتیی (سارتەر)ی دەکرد، تا وای لێهات سارتەر بە "سەگی پاسەوانیی حزبی کۆمۆنیست" ناوی ببات، ئەمیش لەو حزبو بیرە هەڵگەڕایەوەو بوو بە موسڵمانو... هتد.

لە هەموو ئەمانەش سەیرتر، (ئێرنست هابەرمان)ی باوکی یۆرگن هابەرماز یەکێك بووە لە نازییە بەدناوەکان، نموونەی دیکەش زۆرن، ئەگەر زەمینەی فکری ئەوەی لەبار بایە کە خاوەنەکەی لە هەڵەی گەورەو خاوەن کاریگەریی زۆر و درێژخایەن دووربخاتەوە، دەبوو ئەم کەڵە فەیلەسووفو بیریارانە لە سەرەتاوە تووشی هەڵەیەك نەبووبان کە پاشان خۆیان نەفرەتی لێبکەن.

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، بیری مرۆڤایەتی، چ لە چوارچێوەی فەلسەفیدا جێی بکرێتەوەو چ لە هەر چوارچێوەیەکی دیکە، نە کیانێکی نەگۆڕ و پیرۆزە، نە توانای گۆڕینی چینە قووڵەکانی هەیە، بەڵکو پتر کاریگەریی نزیك لە کاریگەریی ئێش دامرکێنەوە، یان ماددەی سڕکەری هەیە، مەودای ئەو کاریگەرییەش، بە کورتی و درێژییەوە، بەندە بە کۆمەڵە هۆکارێکی هەمیشە گۆڕدراوەوە.

**د. ئاراس: ئایا دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالی‌و مەولەوی‌و مەحوی‌و سالم‌و چەندانی دیکە بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: بە پلەی سەرەکی بەرهەمی حوجرەیە، بەڵام تایبەتمەندییەکانی ئەو داهێنەرانەش رۆڵی بناغەیی دەبینن، لەو تایبەتمەندییانەش: جۆری بیرکردنەوە، ئاستی تێگەیشتنی خود و دەوروبەر، گیانی گەڕان بەدوای رووبەرە نەبینراو و نەدۆزراوەکاندا، جۆری ئەو سەرچاوەیانەی دەیانخوێندنەوەو یەکلایەنی‌و فرەلایەنیی ئاسۆی تاکەکەسی، پلەی ئارام‌و ددان بەخۆداگرتن لە پرۆسەی گەڕان بە دوای ڕاستییەکاندا و پەلەکردن‌و لەسەرخۆبوون لە ئەنجامگیرییکردندا، ئاستی تاقیکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی لایان دروست دەبێت، چەندین لایەن‌و هۆکاری دیکەی پەیوەست بە خود، یان ژینگەو دەوروبەر.

**د. ئاراس: حاجی قادری کۆیی‌و مەلای گەورەی کۆیە، ئەو دنیابینیی‌و نوێخوازییەی هەیانە بەرهەمی حوجرەیە، یان بەهۆی کاریگەربوونیان بە بزاڤی رۆشنبیری ئەوروپا، وەك حاجی قادری کۆیی لە ئەستەنبوڵ‌و کاریگەربوونی مەلای گەورە بە بیری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەددینی ئەفغانی‌و شێخ محەممەد عەبدەیە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: لای ئەوانیش هەر حوجرە سەرەتاگە و دەستپێك و بناغە بوو، پاشانیش شەپۆلی گەورەی بیری رۆژئاوایی رووکرد و لە ناوچەکەمان بە ئاڕاستەیەکی دیکەبردنی‌و ئاسۆی تازەی بیری بۆ کردنەوە.

**حوجره بناغه بوو، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەو ئاستە خوێندەوارییەیان** نەبوایە توانای ڕۆیشتن لەگەڵ گۆڕانەکانی ئەو سەردەمەیان نەدەبوو، بە گشتییش، نەوەیەکی خوێندەواری ئەو سەردەمە، نەك تەنها حاجی قادر و مەلای گەورە، بە چەند ئاست و ئاڕاستەیەکی جیاواز کەوتنە بەر ئەو کاریگەرییە و لە هەندێکیاندا بووە مایەی تەوژمێکی بەهێزی ناوەوە بە ئاڕاستەی بوون بە هێزێکی پاڵنەری دەربڕین، لای هەندێکی دیکە بووە هێزی بیرکردنەوە لە گەشەسەندنی زانستیی تەکنۆلۆژی و ئابووری، لای کەسانی دیکەش تەنها بووە مایەی وەدەست هێنانو کەڵەکەبوونی زانیاریی نوێ.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢ دانەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقی)م دەست کەوت و خوێندمەوە پەردە لەسەرچاو و دڵم لاچوو، لەبارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە" ئایا پڕۆگرامی حوجرە ئەوندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: کێشەکە کێشەی (پڕۆگرامی حوجرە) و گۆڤاری (العروة الوثقی) نییە، ئەو گۆڤارە لە فەڕەنسا لە لایەن جەمالەددینی ئەفغانیو محەممەد عەبدەی قوتابییەوە دەردەکرا، زمانحاڵی کۆمەڵەیەکی سیاسی بوو بە هەمان ناوەوە، ئەفغانی کە پێشتر لە بەریتانیا بوو، پاش شکستی شۆڕشەکەی ئەحمەد عەڕابی (١٨٧٩ تا ١٨٨٢) دژی خدێوی تۆفیق، لە لایەن ئینگلیزەوە ناچار کرا تاراوگە (منفی)ی خۆی هەڵبژێرێت، ئەویش فەرەنسای هەڵبژارد، لەوێوەشەوە محەممەد عەبدەی قوتابی، کە

ئەویش بۆ لوبنان دوورخرابووەوە، بانگکرد بۆ لای خۆیو پێکەوە کۆمەڵەکە و گۆڤارەکەیان دامەزراند، واتە هۆکاری پەیدابوونیان هۆکارێکی سیاسیی پەیوەست بە شکستی ئامانجێکی رزگارییخوازانە بوو.

محەممەد عەبدە لە نامەیەکی بۆ (وێڵفرید بێلنت)ی شاعیری ئینگلیزیی دۆستیدا، لە بارەی ئامانجی گۆڤارەکەوە دەڵێ: "ئامانجمان پاراستنی سەربەخۆیی گەلانی رۆژهەڵاتە لە دەستدرێژیی وڵاتانی رۆژئاوا و شێواندنی ئۆقرەیی ناخی حکوومەتی ئینگلیزی، بەو مەبەستەی لە کارە خراپەکانی دژی موسڵمانان پاشگەزببێتەوە".

ئاشکرایە کە ئەم جۆرە پەیامە پێویستە بۆ ئەو سەردەمەی خوالێخۆشبوو (شێخ محەممەدی خاڵ) باسی لێوە دەکات، لە حوجرەدا نەبووە، گومانیش لەوەدا نییە کە بۆ ئەو مەبەستە هەرگیز حوجرە نەیدەتوانی چاوی کەس بکاتەوە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "لە ژێر کاریگەریی نووسینو بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانیدا کەوتمە بیری فەرهەنگ دانانو گرنگی دان بە زمانی کوردی" بۆچی خوێندنو ژینگەی حوجرە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: دیسانەوە مەسەلەکە جیاوازە لەوەی لە حوجرەدا هەیە، ئەگەر مەسەلەکە دانانی فەرهەنگ (قاموس) بێت بە زمانی کوردی، خۆ خوالێخۆشبوو شێخ مارفی نۆدێ، زۆر پێش ئەوە، فەرهەنگی شیعری (عەرەبی ـ کوردی) دانا، ئەمەش لای کەس شاراوە نییە، ئەگەر

مەسەلەکەش گرنگییدان بێت بە زمانی کوردی، ئەوا زانا و شاعیر و داهێنەرانمان گەلێك پێش ئەو گۆڕانکارییانە بایەخی زۆر جیدییان بە زمانی کوردی دا و رۆڵی ئێجگار گەورەشیان لەو بوارەدا گێڕا.

ئەوەی خوالێخۆشبووی خالْ باسی لێوە دەکات بە شێوازێکی نوێی جیاواز لە شێوازە باوەکەی حوجرەیە ، ئەمەش بۆ ئەمڕۆی ئێمە شاراوەو نویێ نییە.

**د. ئاراس: بۆچی هەریەك لە مەلای گەورەی کۆیەو شێخ محەممەدی خالْ نەیانتوانی وەك نوێخوازێکی ئایینی دەربکەون، لەکاتی خۆیاندا؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: ئاڕاستەی کارتێکردنی گۆڕانکارییەکانی ئەو سەردەمە بەسەر ئەو دوو زاتەدا ئەوە نەبوو کە بیانکاتە (نوێخوازی ئایینی)، چونکە تەوژمەکە پاشماوەی تەوژمی نوێگەرایی (الحداثة ـ Modernity) بوو، ئەویش بەو شێوەیەی گەیشتە لای ئەوان، نوێگەراییش هەر درێژەیەکی گۆڕانە لە ئایین یاخیبووەکانی ئەوروپای درێژەپێدەری پشتبەستن بە (ئاوەزگەرایی ــ الاتجاه العقلي) و (ئەزموونگەرایی ــ الاتجاه التجريبي) و رێنیسانس‌و شۆڕشی پیشەسازییە، هەر کەسێکیش دەرکی بەمە کردبێت، یان نەء، ناتوانێ بەو میتۆدە ببێتە (نوێخوازی ئایینی)، چونکە ئاڕاستەکان، نەك تەنها جیاوازن، بەڵکو هاودژیشن، واتە دەرەنجامەکانی ئەو هەرگیز ناتوانرێ بۆ بەرژەوەندیی ئەم، بەکار بهێنرێت.

**د. ئاراس: ڕێگرو کۆسپەکانی بەردەم بیری نوێخوازی شێخی خاڵ چی بووە؟ بۆچی پرۆسەی پەروەردەو زانستی ئایینی لە کوردستاندا نەیتوانیوە خۆی نوێبکاتەوەو لەگەڵ گۆڕانەکانی سەردەمدا بچێتە پێشەوە؟**

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: ئاسان نییە ئەمڕۆ، پاش ئەو دەیان ساڵەی بەسەر هەوڵەکانی خوالێخۆشبوو شێخی خاڵدا تێپەڕیوەو چەندین فاکتەری گرنگی ئەو سەردەمە تەنانەت شوێنەواریشیان نەماوە، ئاسان نییە پەی بە جۆری ڕێگر و کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەم کۆششە نوێخوازەکانی خوالێخۆشبوو ببرێت، بەڵام کۆمەڵە خاڵێکی گرنگیش هەن کە پێموایە ڕۆڵی بەرچاویان لە سەرنەکەوتنی خاڵ لەو کۆششانەدا هەبووە.

یەکەمین‌و گرنگترین ئەو خاڵانە بریتییە لەوەی کەسانێکی هاوبۆچوون‌و دڵسۆز و کارا و بە هیممەت لە ژینگە ڕاستەوخۆکەی خاڵدا نەبوون کە پاڵپشتیی لێبکەن‌و دەنگو بۆچوونە هاوبەشەکانیان بگەیەننە سەرچاوەکانی بڕیارو میکانیزمەکانی جێبەجێکردنیان بدۆزنەوەو کارای بکەن.

ئەو کۆششانەی خوالێخۆشبوو، هێندەی من ئاگام لێبووبێت، بە داخەوە دەنگێکی بێ زایەڵە بوو لە بواری پراکتیزەکردندا، ئەگەر دەنگی هاوئاڕاستەی دیکەش هەبووێت ئەوا بە جیاوازی کاری کردووە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی دەردە کۆنە ـ تازەکەی، نەبوونی گیانی کاری هاوبەشە لەنێو کورددا.

دووەمین فاکتەر (هۆکار) بریتییە لەوەی لەو سەردەمەدا دامەزراوە (المؤسسة) بە شێوەیەك لە شێوەکان هاتبووە ئاراوە، لەو ڕێگەیەوە پێشنیاز و دەستپێشخەرییەکان بۆی هەبوو ببێتە بڕیاری کردەیی، روونیش نییە تا چەند شێخی خالْ ئەم راستییەی لا بووەتە بنەمایەکی کارکردن و لە شوێنە پەیوەنیدارەکاندا هەوڵەکانی خۆی خستووەتە گەڕ؟! تا چ ڕادەیەکیش بواری گەیشتن بە بەرپرسانی ڕاستەقینەی بۆ رەخساوە؟، یان پەی بە زمانو شێواز و ڕێگەی قەناعەت پێهێنانی ئەوانو پیادەکردنی بۆچوونەکانی خۆی بردووە؟.

سێیەمین هۆکار ئەوە بووە کە کاربەدەستو سەرچاوە ڕاستەقینەکانی بڕیار بیانی بوون، لە سەرەتاکانی بە دامەزراوکردنی کاردا زۆرینەی کاربەدەستە نە شارەزا و ناشییەکاندا بۆ خەڵقی خۆشیان هەر لووتبەرز و ناتەبا و ناهاوکارن، چ جای ئەوەی بێگانە بنو خۆیان سەر بە نەتەوەی باڵادەستو زاڵ بزانن !.

چوارەمین هۆکار ئەوەیە کە ئەو گۆڕانانەی پێویستە ڕوو بدات، بە تایبەت بەو شێوازەی کە لە گۆڤاری (العروة الوثقى) و سەرچاوەکانی کارکردن بەسەر شێخی خالْدا خرابوونە ڕوو، گەلێك لەوە پێشکەوتووتر بوون کە عەقڵی نیمچەکۆلۆنیالیی زاڵ بەسەر دامەزراوەکانی ئەو سەردەمەدا دەیخستە ڕوو و پیادەی دەکرد، بۆیە لە بناغەدا دروستکردنی خالْو هێڵی هاوبەش لە نێوان دەرەنجامەکانی بیری پێشکەوتووی دامەزراو لەسەر بنەما زانستییەکانی (دەوڵەتی نەتەوایەتی ـ Nation State)ی ئەورووپای بە

تەواوی بێدار و عەقڵی پاشماوەی دەرەبەگایەتیی تێکەڵ بە چەمکە شێواوەکانی مۆدێرنێتەی داگیرکەری پاش کەمالیزم و گوازراوە بۆ شێوازەکانی حوکمی پاش ئەوەش، دروستکردنی ئەو خاڵو هێڵە هاوبەشە لە نێوان ئەو دوو بۆتە لە یەکتر نامۆیە، کارێکی زۆر سەخت بوو.

لە سایەی ئەم ڕاستییانە و دەیان هۆکاری شاراوەی هاوشێوەدا ئاسان نییە کۆششی دڵسۆزانە سەربگرێت، چونکە زەمینەکە بە گشتی زەمینەی ناتەبایی‌و دوورخستنەوەیە، نەك تەبایی‌و یەکخستنی کۆششە دڵسۆزانەکان.

هێندەی پەیوەندیی بە (خۆنوێکردنەوە)ی پرۆسەی پەروەردە و زانستی ئایینیشەوە هەیە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئەو تەوژمەی مۆدێرنێتە، جگە لەوەی لە بناغەدا یاخیبوون بووە دژی هەژموونی ئایین بەسەر بیرکردنەوەو دەسەڵاتو دامەزراوەکانی، هەریەکەش لەو دوو ئاڕاستەیە تایبەتمەندیی جیاوازی خۆیان هەبووە کە بەلای کەمەوە، لەم جومگە هەستیارانەدا بەم شێوەیە دژی یەك بوون:

ـ مۆدێرنێتە، بە تایبەت لە سەرەتاکانیدا، پشت بە چەمکی (توانای بێ پایان)ی ئاوەز (عەقڵ)، یان ئەزموون (تجربة) یان هەردووکیان پێکەوە دەبەست، عەقڵو هەستو چاودێریی ڕاستەوخۆی دیاردەکانو حاڵەتە دووبارەبووەکانی دەکردە بنەماکانی پێکەوەنانی هەر جۆرە تیۆرییەکی زانستی، کەچی لە حوجرەدا بە سەرەکییترین شێوە سروش (الوحي) سەرچاوەی هەرە بناغەیی زانیارییە، شانبەشانی ئەمەش بۆ ڕوونبوونەوە

(الكشف) و (چەژ ـ الذوق) و (پێبەخشین ـ الإلهام) میکانیزم و توخمە یاریدەدەرەکانی وەدەستهێنانی ئەو زانیارییەن.

ـ لە میتۆدی مۆدێرنیتەدا مرۆڤ لە هەموو ئەو چالاکییانەدا سەربەخۆ و داهێنەر و بڕیاردەرە، بەڵام لە میتۆدی حوجرەدا خوای گەورە بڕیاردەری ڕاستەقینەیە و مرۆڤ بەپێی نزیکبوونەوەی لە خوا زانینی پێدەبەخشرێت.

ـ لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی مۆدێرنیتەدا چەمکەکانی (نادڵنیایی ـ اللاحتمية)، (ڕێژەییبوون ـ النسبية) و " گۆڕاو بوون ـ التحوليّة) خەسڵەتی ئەو زانستەن کە وەدەستدێت، هەموو ئەو چەمکانەش ڕەنگدانەوەی سروشتی هەمیشە گۆڕاو و گەشەسەندوو و پێشکەوتووی زانستن، بەڵام لە چەمکەکانی حوجرەدا، زانیاری، چونکە لە خوای گەورەوەیە، پایەدار و نەگۆڕ و دەرك پێنەکراو و خاوەن مۆرکی تایبەتی خۆیەتی، هەر جۆرە زانیارییەکی ڕاستەقینەش بێتە ئاراوە ڕەنگدانەوەی بەخششی خوایە بە بەندەیەکی دیارییکراوی‌و بۆ مەبەست ـ حیکمەت ـێکی دیارییکراوی شاراوەشە.

کەواتە ناتوانرێ بیر لە (خۆنوێکردنەوە)ی حوجرە بە دەرنجام‌و پێوەرەکانی عەقڵانییەت‌و مۆدێرنیتە بکرێتەوە.

## د. ئاراس: بۆچی لەگەڵ هاتنی سیستمی نوێی خوێندن‌و قوتابخانەدا، خوێندنی حوجرە پاشەکشەی کرد؟

مامۆستا عەبدوڵڵا قەرەداغی: دەکرێ سیستمی (حوجرە) و (سیستمی نوێی خوێندن) بە (کۆچەرییبوون) و (نیشتەجێبوون) بشوبهێنرێت.

له یەکەمیندا کۆتو پێوەندی جموجووڵ زۆر کەم بوون، فەقیێ، له پله جیاوازەکانی پێشکەوتنی خوێندنیدا ئازاد بووه لەوەی له کویێ بخوێنێت و چ مامۆستایەك هەڵببژێرێت، واته له کاتێکدا که دەرسی فیقه، یان تەفسیر، یان فەرموودەی لای مامۆستایەك بووه که زۆر سەرکەوتوو بووه لەو بوارەدا، دەرسی مەنتیق، یان عەقائید (علم الكلام)، یان فەلسەفەی لای مامۆستایەکی دیکه بووه که لەو بوارەدا باڵادەست بووه، به هەمان شێوەش لەگەڵ (ئەستێرەناسی) و (حیساب)و.... هتد، رەفتاری کردووه، بۆیه دەبینین فەقێکانی کوردستان، ئەگەر ئارەزوویان له خۆ بەهێز و شارەزاکردن له هەر بوارێك بووبێت توانیویانه باشترین مامۆستای ئەو بواره هەڵبژێرن، بەڵام بۆ ئەم مەبەستەش ژیان و ماڵ و سۆز و ئارەزووه تایبەتەکانیان وەلاوه ناوه، ئەمەش لەم رۆژەی ئێمەدا زۆر به کەمی رووی تێدەکەن، یان هەر کەس نییه رووی تێبکات.

جگه لەمەش گوزەرانی مەلا و فەقێکانی کوردستان و بەڕێوەبردنی مزگەوتەکان له لایەن گوندەکانی کوردستان، واته له لایەن خەڵقییەوه دابین دەکران ، زۆربەی هەره زۆری ئەم جۆره مزگەوتانه له گوندەکان، یان شارۆچکه بچووکەکاندا بوون، واته حکومەتەکان ئەو بونیاده (حوجره)یان نەدەناسی‌و تەنانەت ددانیشیان پێدا نەدەنا.

له بەرانبەری ئەمەشدا، قوتابخانه له شوێنێکی دیارییکراوه، له سەرەتاوه بۆ ئەوه له لایەن حکوومەتەوه دروست کران که دەرچووانیان له دامودەزگاکاندا دابمەزرێن‌و گوزەران‌و شوێن‌و پایەی کۆمەڵایەتیی جیاوازییان

هەبوو، هەروەها بەرنامەکانی ئەم سیستمە فرەلایەن و هەمەجۆرتر بوون و پسپۆڕیی تازەی ئەوتۆ لەم سیستمەدا، بە تایبەت لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی خوێندندا، هاتنە ئاراوە کە پتر لەگەڵ ژیانی تازە و پێویستییەکانی کۆمەڵ دەگونجان، وەکو پزیشکی و ئەندازیاریو.... هتد، سەرجەمی ئەمانە و نەهێشتنی گوند لە کوردستاندا، لە لایەن رژێمی بەعسی صەددام حسەینەوە، بە تەواوی بووە مایەی ئەوە، نەك تەنها سیستمی حوجرە خۆی نویَ نەکاتەوە، بەڵکو تەنانەت ببێتە شتێکی نامۆش، هەڵبەتە هۆکاری دیکەش هەن، بەڵام ئەمانەی باس کران هەرە گرنگەکانن.

## دیمانەی چوارەم

# دیداری بەڕێز مامۆستا سەلام مەنمی

بەڕێز مامۆستا سەلام مەنمی سالآنێك لە نزیكەوە مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵی ناسیووەو ئاگاداری رەوشی خوێندنو بزاڤی رۆشنبیری كوردی سەدەی رابردوو بووە، خوالێخۆشبووی باوكیشی (مەلا غەفوری باڕۆیی) فەقێی شێخی خاڵ بووە، لەبەر ئەوە بەڕێزیان ئاگاداری ئاستی رۆشنبیریو بیركردنەوەو زۆر دیدو بۆچوونی مامۆستا خاڵن.

مامۆستا سەلام مەنمی وەك نووسەرو چیرۆكنووس و رۆشنبیرێكیش كە هەوڵ و جێگەدەستی لە نێوەندی رۆشنبیریی كوردییدا دیارە، خولیا و هەوڵی بەرەوپێشبردنی ئاستی رۆشنبیری كوردی هەبووە، دەكرێت لەگەڵ شێخی خاڵدا زۆر گفتوگۆو بیروڕا گۆڕینەوەیان هەبووبێت، ئێمەش لەم ڕوانگەوە ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا.

**د. ئاراس: مامۆستا سەلام پێوەندی بەڕێزتان‌و شێخی خاڵ چۆن بووە، بەڕێزتان کەی مامۆستا خاڵتان ناسیوە؟**

مامۆستا سەلام: من لە کۆتایی چلەکانی سەدەی رابردوودا بۆ خوێندن هاتمە سلێمانی، لە تەکیەی شێخ حەکیم دامەزرام، دەستم بە خوێندن کرد، کتێبی (عوامل الجرجاني)م لای مامۆستا مەلا قادری حەسەن باپیر دەخوێند، مامۆستایەکی باش بوو، سوودی زۆرم لێوەرگرت، هەر لەو تەکیەدا رۆژێك کتێبێکی مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵیان هێنا (البيتوشي) بە زمانی عەرەبی بوو، بۆ فرۆشتن، منیش دانەیەکم لەو کتێبە کڕی‌و خوێندمەوە، هەرچەند زۆر لێی تێنەدەگەیشتم، ئیتر بەرە بەرە مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵم ناسی، بە تایبەتی لە تاقیکردنەوە گشتیەکانی فەقێیەتی بۆ رزگار بوون لە خزمەتی سەربازی، ماوەی تاقیکردنەوەکان دوازدە ساڵ بوو، ئەم تاقیکردنەوانە دەکرا بۆ ئەوەی ئەو فەقێیانەی کە دەردەچن نەچن بۆ خزمەتی سەربازی، ئەو کاتە شێخی خاڵ سەرۆکی ئەو زانایانە بوو کە ئێمەیان تاقیدەکردەوە، ماوەی حەوت ساڵ من بەشداری ئەو تاقیکردنەوانەم کرد و هەتا پۆلی حەوتم بڕی، دوای ئەو ماوەیە کەڵکەڵەی ئەزهەر کەوتە سەرم و لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا ئەوراقی خوێندنمان پێشکەش بە ئەزهەر کرد، بەڵام لەلایەن حکومەتی ئەوکاتی عێراق کە نوری سەعید سەرۆك وەزیران بوو رێگری کراین، نەمانتوانی قبوڵ لە ئەزهەر وەربگرین، چونکە ئەو کاتە ڕادیۆیەکی کوردی لە قاهیرە بە پاڵپشتی حکومەتی میسری کرابووەوەو لەلایەن چەند قوتابیەکی کوردەوە بەڕێوەدەبرا، هێرشی دەکردە سەر حکومەتی عێراق، بە ئێمەشیان وت دەچن بۆ قاهیرە بۆ ئەوەی

جنێومان پێبدەن، ڕێگرییەکە زیاتر سیاسی بوو، پێوەندی بە خوێندن و بڕوانامەو نمرەوە نەبوو، ساڵ هاتو ساڵ ڕۆیی خوێندنم کۆتایی پێهێنا لە سلێمانیو هەڵەبجەو پریسو عەبابەیلێ و بیارە، لە ساڵی ١٩٥٧ لە مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە سلێمانی لە سەر دەستی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چروستانی ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا زۆر لێم ڕازی بوو.

هەر لەسەردەمی خوێندنی فەقێیەتیدا تاقیکردنەوەی کۆڕی زانیارییماندا، لیژنەکە بریتی بوون لە:

یەکەم: شێخ محەممەدی خاڵ: سەرۆك.

دووەم: مامۆستا مەلا ڕەحیمی پەرخی: ئەندام.

سێیەم: مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چروستانی: ئەندام.

چوارەم: مامۆستا سەید عارفی خورماڵی: ئەندام.

ئەوانەش بەشداری ئەو تاقیکردنەوەمان کرد بریتی بووین لە:

یەکەم: شێخ عەلادین شێخ نوری بابەعەلی تەکێیی.

دووەم: حەمەکەریم ڕەمەزان هەورامی.

سێیەم: سەلام عەبدولغەفوری مەنمی.

بڕوانامەی ئەو کۆڕەمان وەرگرت بۆ ئەوەی پاڵپشتمان بێتو پلەیەك وەربگرین، بەڵام بێسوود بوو، چونکە بە تاقیکردنەوەی دەرەکی بوو.

لەو تاقیکردنەوەدا شێخ عەلادین یەکەم بوو، سەلام مەنمی دووەم بوو، حەمە کەریم هەورامی سێیەم بوو.

هەر لە خانەقای مەولانا خالید خەریکی خوێندن بووم، بەیانییەك حەمە کەریم هەورامی هاوڕێم هات بۆ لام وتی: مژدە بێت شۆڕشە، شۆڕشی ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ بەسەر ڕژێمی پاشایەتیو حکومەتی نوری سەعیدا، ئیتر بەئاسانی دەچین بۆ قاهیرە.

جارێکی دیکە تەقدیمی ئەزهەرمان کردەوە، دوای کەمتر لە ١٥ رۆژ وەڵاممان وەرگرتەوەو وەرگیراین، ساڵی ١٩٥٨ـ ١٩٥٩ چووین بۆ ئەزهەرو لەوێ لە دوای تاقیکردنەوە لە دوا پۆلی سانەوی ئەزهەر وەرگیرام، قۆناغی ئامادەییم تەواو کردو لە قۆناغی یەکەمی کۆلێجی شەریعەی زانکۆی ئەزهەر وەرگیرام، بەڵام بەهۆی زروفی سیاسییەوە گەڕاینەوە بۆ عێراق، لە بەغدا جارێکی دیکە تەقدیمی کۆلێجی شەریعەی بەغدام کردو لەوێ وەرگیراین، لە ساڵی ١٩٦٥ تەواوم کردو بوومە مامۆستا لە سانەوی صەلاحەدین لە سلێمانی.

لێرەدا دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ زەمانی فەقێیەتی: لە مزگەوتی سەید حەسەن لای مامۆستا مەلا سەید غەفور کتێبی (المختصر)م دەخوێند، هەر رۆژێك نەخۆش بوایە، یان کارێکی هەبوایە دەیوت بچۆ بۆ لای مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ دەرسەکەت بخوێنە، شێخی خاڵ کە دەستی بە ڕاڤەی دەرسەکە دەکرد بە راستی زانایەکی گەورەو بە توانا بوو، بە راستی سوودی زۆرم لێوەرگرت، کاتی خۆیشی باوکم (حاجی مەلا غەفوری باڕۆیی) لای شێخ محەممەدی خاڵ لە مزگەوتی شێخ محەممەدی بەرزنجی، خوێندویەتی، باوکم زۆر ستایشی دەکردو دەیوت سوودێکی زۆری لێوەرگرتووە، لە کاتی تاقیکردنەوەی فەقێکاندا بۆ دەرباز بوون لە خزمەتی سەربازیی، مامۆستا

شێخ محەممەدی خاڵ سەرۆکی لیژنەکە بوو، منی ناسیەوە وتی: **ها** کوڕی غەفورە سوور چۆنی؟ مامۆستا مەلا رەحیمی پەرخیو مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چروستانی زۆر ستایشیان کردم لای شێخی خاڵ.

ساڵێك محەممەد مەحموود صەواف هاتبوو بۆ سلێمانی، دەیانوت هاتووە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی (الإخوان المسلمون) شێخ محەممەدی خاڵ لەو کۆڕو کۆمەڵەدا وەك میوان بە تەنیشتیەوە دانیشتبوو.

**د. ئاراس: مامۆستا خاڵ چۆن لە رەوشی خوێندنو ئاستی زانستی حوجرەو خوێندنی مەلاکانی دەڕوانی؟**

مامۆستا سەلام: لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە فەقێکانی سلێمانی بیری کردنەوەی کۆلێژێك کەوتە سەریان، بۆ ئەوەی ڕاتبەی فەقێو دەقنە و مانگانە و چێشتی ماڵان کۆنەکەنەوە، ئەوەیان بە سواڵ دەزانی، مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ و مەلا سەید غەفورو مستەفا زەڵمی پشتیوانی فەقێکان بوون، شێخی خاڵ لە سەرووی هەموویانەوە دەیوت بۆچی لە بەغداو نەجەفو کەرکوك فەقێ قوتابخانەی رەسمییان بۆ کراوەتەوە، ئەی لە سلێمانی بۆچی نەکرێتەوە، هەتاکەی فەقێکان لە دەرگای ماڵان بدەن، چونکە لای وابوو ئەو کۆلێژە چاوو مێشکیان دەکاتەوەو دەبنە کەسانی رۆشنبیرو خزمەتی وڵاتەکەیان باشتر دەکەن، دوای خوێندن فەقێ دەبووە مەلای گوندەکان و ئەگەر ساڵێك باران نەبارییایە، یان نەهاتی بوایە مەلا هیچی دەستنەدەکەوتو زۆر بە کولەمەرگی دەژیا.

**د. ئاراس: ئایا شێخی خاڵ بیری نوێخوازی ئیسلامی (تجدید)ی هەبووە؟**

مامۆستا سەلام: بەڵێ شێخی خاڵ لەگەڵ نوێخوازییدا بوو، بە شێوەیەکی هاوچەرخانە بیری دەکردەوە، شێخی خاڵ بە کێك لە زاناکانی ڕابوونی زانستی (النهضة العلمیة) دادەنرێت، هەروەك چۆن لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبیدا جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەو محەممەد رەشید رەزاو چەندین زانای دیکە بە زانایانی ڕێنیسانس (النهضة) دادەنرێن، لە چەرخی خۆیاندا جێگەیان دیار بووە، شۆڕش و گۆڕانکاری گەورەیان بەرپاکردووە، ئەو شۆڕشو نوێبوونەوەیەش بووە بە قۆناغێکی مێژوویی کە هەرگیز ناسڕێتەوە.

**د. ئاراس: بۆچی شێخی خاڵ بۆ زیاتر گرنگی بە رۆشنبیران داوەو کەمتر مەلاکان لای کۆبوونەتەوە؟**

مامۆستا سەلام: مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ بە ڕواڵەت پەیوەندیەکی وەهای لەگەڵ مەلاکانی سلێمانیدا نەبوو، بەڵام ئەگەر شتێکی لازەحمەت بوایە پرسیاری لە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چروستانی و مامۆستا سەید عارف و مامۆستا سەید غەفور دەکرد، جار جاریش لە مامۆستا مەلا ڕەحیمی پەرخی، پەیوەندی زۆری لەگەڵ مامۆستا محەممەد مستەفا کوردیدا هەبوو، کە رۆشنبیرو ئەدیبێکی زۆر گەورە بوو، بە تایبەت لە بواری زمانەوانی و پەندی پێشینان و فەرهەنگدا دەستی باڵای هەبوو، لە دانانی فەرهەنگی خاڵو پەندی پێشینانی مامۆستا خاڵدا زۆر هاوکاریی دەکرد، زۆربەی پەندی

پێشیانی لە ڕێگەی مامۆستا محەممەد مستەفا کوردیەوە کۆکردەوەو کردی بە کتێبو بەناوی خۆیەوە بڵاوی کردەوە، لە کاتی نەخۆشیەکەیدا من و مامۆستا مستەفا صالح کەریمو خوالێخۆش بوو ڕەئوف ئالانی چووین بۆ زیارەتی، سەیرمان کرد زۆر هیلاك بوو، دەیوت من ئەم ژیانەم بۆ ئەوە نییە پارووی چەور بگلێنم و خۆش ڕابوێرم، بەڵکو حەزدەکەم جارێ نەمرم هەتا پرۆژە زانستیی و رۆشنبیرییەکانم تەواو دەکەم و ئەوکات بمرم.

**د. ئاراس: چۆن شێخی خاڵ هۆگری قوتابخانەی ئیسلاحیی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدە بووە؟**

مامۆستا سەلام: هەموو شۆڕش و نوێبوونەوەیەکی زانستیی پێگە و بارودۆخی خۆی هەیە و لە هەموو شوێنێکدا وەك قارچك هەڵناتۆقێ، شێخی خاڵیش لەو سەردەمەدا بووە کە زانایانی بوژانەوەی زانستی بانگەوازی نوێبوونەوەو گۆڕانکارییان کردووە، کاتو سەردەمی شێخی خاڵیش ئەوەی خواستووە، بۆیە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوان.

**د. ئاراس: کێشەو بەربەستەکانی بەردەم بیری نوێخوازیی شێخی خاڵ چی بوون؟**

مامۆستا سەلام: بەرەی کۆنەپەرستیو بیری تەقلیدیی و ژەنگاویی داخراو ئەوەندە چڕبوون لەو سەردەمەدا، خاڵ نەیتوانیوە لە سەدا سەد بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵ بێت، بەڵام ئەوەشمان لە یاد نەچێت شێخی خاڵ قوتابی نوێخوازی هەبووەو ویستویانە لەو دەریا قوڵەدا مەلەوانی بکەن، وەك شێخ محەممەدی قەرەداغی خەتیب، مامۆستا ڕەئوف ئالانی و محەممەد

بەهادین صاحب‌و مامۆستا بابا عەلی کوڕی مامۆستای گەورە شێخ عومەر قەرەداغی‌و چەندانی دیکە.

**د. ئاراس: ئایا پێش شیخی خالْ کەسی دیکە لە کوردستان هەوڵی نوێگەریی (تجدید) داوە؟**

مامۆستا سەلام: لە پێش شێخی خاڵدا ئەوەندەی من ئاگاداربم ئایەتوڵڵای مەردۆخی سنەیی هەبووە.

**د. ئاراس: ئایا کاتێك شێخی خالْ دەچێتە ناوەندە رۆشنبیرییەکان‌و وەك رۆژنامەنووسێك رۆڵ دەبینێت‌و تەفسیری خالْ بە شێوازێکی نویْ و لەسەر رێبازی قوتابخانەی ئیسلاّح و تەفسیری (المنار) دەنووسێت، لەلایەن ناوەندە تەقلیدیی‌و داخراوەکانەوە توشی گرفت‌و کێشە نەبووە؟**

مامۆستا سەلام: تەفسیری شێخی خالْ سەنگێکی گەورەی هەبوو لای رۆشنبیران و خوێنەرانی قورئانی پیرۆز، چونکە کەس لە پێش شێخی خاڵدا بە زمانی کوردی تەفسیری قورئانی پیرۆزی نەکردووەو وەك ئەو لایەنە رەوانبێژییەکانی دەرنەخستووە.

ئەوانەی لەگەڵ شێخی خاڵدا نین لە تەفسیری خاڵدا، مەبەستیان پێی زانست و خزمەتگوزاری نییە، بەڵکو داخران و ترسە لە نوێبوونەوەو هیچی دیکە.

**د. ئاراس: بەڕێزتان چۆن نووسین و بەرهەمەکانی شێخ محەممەدی خالْ هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا سەلام: بەرهەمەکانی شێخی خالّ بەگشتی کانییەکی سازگارن و چەندەها باڵندەو زیندەوەرانی دیکە ئاوی لێدەخۆنەوە، سوودیان بۆ نەوەی ئێستا و داهاتوو هەیە، پێویستە بە ڕێزەوە سەیریان بکرێت، چونکە چرایەکن درِ بە تاریکی دەدەن‌و مرۆڤ دەخەنە خۆشبەختییەوە، خۆزگە لە کوردستان چەند زانایەکی گەورەو نوێخوازی وەك شێخ محەممەدی خاڵمان هەبوایە.

**ماڵی مامۆستا سەلام مەنمی**

**سلێمانی ـ کارێزەوشك**

**رۆژی یەکشەمە ٢٦:١٢:٢٠١٠**

## دیمانەی پێنجەم

# دیدارێکی تایبەت لەگەڵ مامۆستا حەمەکەریم هەورامی

بەڕێز مامۆستا حەمە کەریم هەورامی کەسێکی دیاری ناوەندی ڕۆشنبیری کوردییە، نووسینو چالاکیە ڕووناکبیرییەکانی زیاتر لە بواری زمانی کوردیو پەروەردەو بزاڤی ڕۆشنبیرییدایە، مێژووی پەروەردەو خوێندن جێگەی گرنگیپێدانی بەڕێزیانە و لەو بوارەدا کتێبو نووسراوی هەیە، ئەوەی جێگەی هەڵوێستەکردنە، مامۆستا حەمەکەریم زیاتر بە چاوێکی ڕەخنەگرانە سەیری پرۆسەکە دەکات و کوێرانە و بێ بەڵگە باس لە ڕەوتی مێژوو ناکات، گرنگی نووسینو تۆمارکردنی مێژوو مەرج نییە هەموو کات بە دڵی ئێمە بێت، بەڵام مەرجە وەک خۆیان تۆماریان بکەینو ڕاستگۆبین لەگەڵ ڕووداوەکاندا، بەڕێزیشیان لە نزیکەوە ئاگاداری هەوڵە ئیسلاحییو نوێخوازییەکانی شێخ محەممەدی خاڵ بووە، بۆ ئاگاداربوون لە هەوڵو کۆششەکانی شێخی خاڵو ئەو کۆسپو بەربەستانەی بەردەم بیری نوێخوازیی شێخی خاڵ بە تایبەتی و بیری ئایینی لە کوردستان بە گشتی، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا.

**دەسپێك: بەڕێز د. ئاراس... بەڕێزت ئەم هەموو پرسیارانەت ئاڕاستەی کەسێك کرد کە تەندروستی لە بارێکی باشدا نەبوو، هەر پرسیارێکیش لە بابەتێکی وادا لێکۆڵینەوەی زۆری دەوێ، من خۆم لە وەڵامەکان زۆر رازی نیم، لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدە سوودیان هەبێت.**

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا حەمەکەریم پەیوەندی جەنابتان و شێخ محەممەدی خاڵ چۆن بووەوە تا چەند لە یەکتر نزیکبوون و بیروڕا گۆڕینەوەتان هەبووە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: من و شێخ محەممەدی خاڵ ماوەیەکی زەمەنی بەرین لە نێوانماندا هەیە، بۆیە تەنها لە دوورەوە دیومەو ناسیومە، من کوڕە جووتیارێکی لادێیی بووم، ئەو لە خێزانێکی شاری ئۆروستۆکراتی مەشرەب، کە قوتابی بووم کتێبێکم دەسکەوت وا دەزانم ناوی: (خوورەوشت) بوو، هەر دەمخوێندەوەو دەمخوێندەوە، نازانم چۆن کاری تێکردبووم، بێ ئەوەی بزانم ئەو کتێبە هی کێیە، کە بووم بە فەقێ لە ساڵەکانی دەوروبەری پەنجاکاندا بۆ خوێندن هاتمە سلێمانی، جاروبار دەمبیست مەلایەك هەیە پێی دەڵێن (قازی) هەر ئەوەندەم لێی بیستبوو، کە مەلایەکی گەورەیە و جبە و پانتلۆن لەبەر دەکات و فێسێکی سووری بە سەرەوەیە، وا هەست دەکەم لە دوورەوە دیومە، بە پیاوێکی بە هەیبەت و بە ویقارو سامناك و حکومیی، لە هۆشمدا وێنەی چەسپاوە.. لە راستیشدا هەروەها بوو، ئەو کات کە بەندە وام لێهات لە نێو فەقێیاندا بناسرێم، ئارەزووم دەکرد لە نزیکەوە (قازی) ببینم و پێی بڵێم: من خوو و رەوشتەکەی تۆم زۆر خوێندووەتەوە، بەڵام ئەو حەزەم نەهاتەدی، چونکە ئەو فەقێی ڕانەدەگرت، لە دیوەخانەکەی خۆیدا

تەنیا لەگەڵ پیاوماقوڵاندا دادەنیشت، من لە کویێ و ئەو لەکویێ، هەتا لە ساڵی ١٩٥٧ کۆمەڵە فەقێیەك لە هەڵەبجەوە هاتن، وایان پێوتبوون کە گوایا لە سلێمانی (کولیەی شەریعە) بۆ فەقێیان کراوەتەوە، هاتنە لای ئێمە، هەموو کۆبووینەوە، چووین بۆ لای قازی لە دائیرەی حکومەت، لە قاتی خوارەوەی (سەرای کۆن)، چووینە ژوورەکەی، پێشوازییەکی گەرمی کردین، پرسەکەمان خستە بەردەستی، وتی شتی وام نەبیستووە کە کولیە بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر حکومەت بیەوێ کاری وا بکات من کتێبخانەکەی خۆم دەفرۆشم بۆ خەرجی کردنەوەی بیناکەی، لەو دانیشتنەدا بەندە بۆ یەکەمجار بە حزووری قازی شادبووم، لە ساڵی ١٩٥٨ منو سەلام مەنمی و جەلال خەڵەف ژاڵەیی خۆمان ئامادەکردبوو بچین بۆ قاهیرە بۆ خوێندن لە زانکۆی ئەزهەر (الأزهر)، وایان تێگەیاندین کە دەشێ لەناو بەڵگەنامەکاندا وێنەمان هەبێت، وێنەکانیش بە جبە و فێسی مەلایانەوە بێ، چووین بۆلای قازی داوای جبەو فێسی مەلایانەمان کرد وێنەی خۆمانی پێوەبگرین، (قازی) یادی بە خێربێت لە دیوەخانەکەی خۆیدا (جبە و فێسەکەی خۆی داینێ) و داوای سەرکەوتنی بۆ کردین.. ئەمەش دووەم جاربوو بەندە بە خزمەتی ئەو زاتە گەورەیە شاد ببم.. پاش ئەوە من پێنج ساڵ لە قاهیرە مامەوەو جاروبار نامەم بۆ دەنارد و نامەی بۆ دەناردم.

**د. ئاراس: وەك بەڕێزتان ئاگادارین، بیری نوێگەری ئایینی (التجدید الدینی) لەکوردستان هەبووە؟ کێ وەك یەکەم کەس هەوڵی نوێگەری داوە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: من وادەزانم بیری نوێگەری ئایینی (التجدید الدیني) بە مانای لادان لە مەسلەکی کۆن، یان چەسپاو و هێنانەدی مەسلەکی نویێ لە جیاتی ئەوە نەبووە، بەلای مەلاکانی ئەوکاتەوە هەر گۆڕانکاریەك چ کەم، چ زۆر، بەکاری ناپەسەند (البدعة) دەدرایە قەڵەم، ناپەسەندیش بەلایانەوە گومڕاییە (کل بدعة ضلالة وکل ضلالة في النار) وایان دەوت، بەڵام ئەوەی ئەوکاتە هاتبووە ئاراوە (جۆرە ئاوەزێك) بوو، دەکرێت بەو ئاوەزە بوترێ (ئاوڕدانەوە بەرەو زمان و کەلتووری کوردی)، چونکە مەلاو فەقێ ساڵەهای ساڵ بوو لە ناو لیتاوی زمانی عەرەبیدا گیریان خواردبوو، لێی هەراسان بووبوون، وەکو ئەو کەسەیان لێهاتبوو بەدرێژایی تەمەنی خەریکی دروستکردنی کلیلێك بێت بۆ ئەوەی قوفڵی پیێ بکاتەوە لەکۆتاییدا کلیلێك دروست بکات قوفڵەکەی پێنەکرێتەوە، لەبەرامبەر ئەمە قوتابخانە هاتە ئاراوە، ئەمەو چەند هۆیەکی دیکە وایان کرد مەلاکان بەخۆیاندا بچنەوەو ئیدی ئەوەندە خەریکی شتێك نەبن سوودێکی ئەوتۆی نەبێت، بۆیە جۆرە بێزاریەك لەم لاو لەولا سەری هەڵدا بە تایبەتی لە نێو فەقێکاندا، هەرچەندە وەرچەرخان و ئاوەز و کرانەوەکە لەلای چەندین مەلاوە سەریانهەڵدا بە هەموویانەوە نەگەیشتنە ئاستی ئەو وەرچەرخانە کە لە لای (قازی شێخ محەممەدی خاڵ) ڕووی دا، بایەخدان بە نووسینی کوردی و دانانی کتێب بە کوردی لای شێخ محەممەدی خاڵ نەخشەیەکی حەکیمانەو ئاستەم بوو، بۆ گۆڕین و چاوکردنەوەی فەقێی ئەو سەردەمە لە پاشادا مەلاکان، خڕکردنەوەی پەندی پێشینانو کردنیان بە کتێب، یان نووسینی فەرهەنگ بە کوردی، بەڵگەی پێشڕەویی ئەو زاتەیە لەو مەیدانەدا، دەکرێت بووترێت

ئەو کارانەی ئەو هەڵهاتنی ئەستێرەی نگینی زمان و رۆشنبیری کوردی بوو کە تائێستاش لە ئاسمانی فیکری نوێی کوردیدا دەدرەوشێتەوە.

کارەکانی، هەم بیری مەییوی مەلاکانی کردەوە، هەم بەلای زمان و کەلتووری کوردیدا وەری چەرخان، هەر لەوکاتەوە مەلاو وتاربێژەکان رۆژی هەیینی دەستیان کرد بە وتار خوێندنەوە بە کوردی، فەقێش رۆژنامەیان دەخوێندەوە، کە مەلاکان بە کارێکی خراپیان دابووە قەڵەم.

وا گومان و ئەجیا دەبەم (شێخ محەممەدی خاڵ) یەکەم مەلا بووە لە سلێمانیدا کچی خۆی بنێرێتە قوتابخانە، چووزانم، ئەمە پێویستی بە ساغکردنەوە هەیە.

**د. ئاراس: ئایا بۆ کات‌و سەردەمی خۆیان، خوێندنی حوجرەکان لە ئاستی پێویستدا بوون؟**

مامۆستا حەمەکەریم: کام پێویست؟ خوێندن لە حوجرەدا بە عەرەبی بووە، بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی، چونکە قورئان بە عەرەبییە، دوانزە عیلمەی مەلایان شتێکی وەهای تێدا نەبووە کە رێ بە خوێنەریان بدات شتێکی وەها فێربن‌و بەکەڵکی خۆیان‌و گەلەکەیان بێت، شتێك کە پێی بووترێ خەمخواری بۆ ژیان‌و دابینکردنی بژێوی رۆژانە و رووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتەکان، لای حوجرە نەبووە، گرینگ لای فێربوونی ڕێزمان‌و وردەکارییەکانی زمانی عەرەبی بوون، سوودی مەلایەتی پێشنوێژی‌و مارەبڕین‌و تەڵاق چاککردنەوەو فەتوادانی حەڵاڵ‌و حەرام بووە، ئیدی ئەگەر (کەر کلکی درێژ بێت، یان کورت) ئەو حەقی نەبوو، ئەوان تەنیا دوعاگۆ بوون، دەستیان بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە، دەیانووت: خوا خراپتری

نەكات! لەسەردەمی پەنجاكانەوە جۆرە گۆڕانێك روویدا، زۆر گرینگەكەیان ئەو ئاوڕدانەوە بوو كە زمانی كوردی لەسەر زمانی مەلاكاندا جێی خۆی كردەوە.

**د. ئاراس: لەگەڵ ئەوەشدا لە نێو پڕۆگرامی حوجرەدا فەلسەفە خوێنراوە، بەڵام بۆ نەبووەتە هۆی پەروەردەكردنی كەسانی عەقڵانیو خەمخۆری خەمەكانی خەڵك لە كوردستاندا؟**

مامۆستا حەمەكەریم: فەلسەفە لە حوجرەدا بۆ ئەوە نەخوێنراوە عەقڵی مەلا لە جوغزە كۆنە چەقبەستەكەی بێنێتەدەرەوە، بەڵكو بۆ ئەوە بووە ئەگەر لەگەڵ غەیرە دیندا گەنگەشەی كرد بزانێ چۆن پارێزگاری لە بنەماكانی ئیسلام دەكات، یان بۆ ئەوە بوو بیسەلمێنن كە فەیلەسووفەكان بە هەڵەدا چوون و لە حەقیقەتەوە دوور بوونو هەموو گومڕابوون، من لێرەدا حەقم بەسەر (فارابی) و (ابی علي سینا) و (فخرالدین الرازي)یەوە نییە، ئیمامی غەزالی پێشڕەوی فیكری مەلاكانی كوردستانە، ئەو لە بیستو یەك پرسی فەلسەفیدا فەیلەسووفەكانی یۆنانی خستووەتە هەڵەوە.

فەلسەفە كە خوێنراوە بۆ ئەوە بووە بەرگری شەریعەتی ئیسلامی پێبكەن، نەك بۆ عەقڵكاری.

لەگەڵ ئەوەشدا شافیعیو مالیكیو ئەحمەدی كوڕی حەنبەل كە پێشەوای مەلاكانن، خوێندنی فەلسەفەیان بە حەرام زانیووە، كەچی مەلاكانی كوردستان گوێیان بە راكانیان نەداوەو خوێندنی زانستی كەلامیان بەدوا ماددەی خوێندنی حوجرە زانیوە، خوێندوویانە بۆ ئەوەی خوێندنی پێتەواو بكەنو ئیجازەی پێوەربگرن، نەك بۆ ئەوەی فێری هۆشكاری بنو

هۆشی خۆیانی پیێ تاو بدەن، یان بۆ ئەوە بووە تا بزانن پێشینانیان چۆن فەلسەفەی یۆنانیان وەرگرتووە، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە کە هەڵەیەو لە حەقیقەتەوە دوورە ـ ئەو حەقیقەتەی کە ئەوان پێیانوابووە حەقیقەتی ئەبستراك و باڵایە ـ ئیدی بە ڕوویاندا دراوەتەوە، ئەوەتانێ یەکێکی وەك ئیمامی غەزالی لە بیست و یەك پرسی فەلسەفیدا لە (تهافت الفلاسفه) دا فەیلەسووفە یۆنانییەکانی بەهەڵە خستووەتەوە... ئەمەی غەزالی هەمیشە لای خوێنەرانی حوجرە ڕەچاو بووە.

ئەمە بابەتێکەو زۆر هەڵدەگرێتو توێژینەوەی دەوێت..

نموونەیەکی زیندووی لای خۆمان هەیە: مەلا باقری مەریوانی دەستێکی باڵای لە وتنەوەی زانست هەبووە، کەچی وشکە دەروێشێکی خانەقای بیارە بووە، کۆلکە حەدیسێکی بەسەر هەزار بەڵگەی هۆشدا (تفضیل) داوە.

کورد لەگەڵ ئەوەشدا ژێر دەستە بووە، کەچی لە مەسەلەی خوێندنو فێربووندا هەمیشە لە پێشەوە بووە، هەرگیز وازی لە خوێندن نەهێناوە، بەڵام لە ترسی داگیرکەر بەو خوێندنە بەرهەمی نەداوە، مەلا ئەوە بووە شەریعەتزان بێت، حەدیسەکانی ئەبو هورەیرە "کاوێژ" بکاتەوە، ئەو مەلایەی فەلسەفە زان بووە، یان عەقڵانیی بووبێت، مەلایەکی مەقبوڵ نەبووە، مزگەوتیان نەداوەتێ تیایدا مەلایەتی بکات.

**د. ئاراس: خوێندنی فەلسەفە زیاتر کەسانی عەقلانیی و بیرکراوە دروست دەکات، بەڵام بەڕای بەڕێزتان خوێندنی فەلسەفە ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلاکانی کوردستان هەبووە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: خوێندنی فەلسەفە ئەگەر کەسانی بیرکراوەی دروستکردبێت‌و لەسەر فیکری مەلاکان ڕەنگیدابێتەوە، ئەو رەنگدانەوە لە دوو حاڵەت بەدەرنەبووە:

یەکەم: رەنگدانەوەی زارەکی: گەلێك مەلا لە ئەنجامی ڕۆچوون بەناو پرسەکانی فەلسەفەدا تووشی وڕێنەکردن بوون، بەشێك لەمانە لایەنی سۆفیگەرییان گرتووەو وتەکانیان لای مەلاکان بە وڕێنە و شەتەحات بۆیان ئەژمارکراوە، هەندێکجاریش وڕێنەکانیان بە کوفر بۆیان دراوەتە قەڵەم، نموونە بۆ ئەمانە (منصوری هەلاجە) کە لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی (سنە)یە، مەلاکان لێی تێنەگەشتوون‌و بە کوشتنیانداوە.. هەندێکیشیان بە لێوەو شێتۆکە دەناسران، ئەوەی دەیانزانی زارەکی بووەو نەخراوەتە سەر قاقەز.

دووەم: رەنگدانەوە لەسەر قاقەز: هەندێکیان توانیویانە لە ژێر سایەی ئەو کاریگەرییەدا میتۆدێك بۆ داڕشتنی بیروڕا فەلسەفیەکانی ئەنجام بدەن، ئەمانەش دەبن بە دوو گروپەوە، گروپێکیان لە ژێر پەردەی ئایین و (تقوی)دا بیروڕاکانی خۆیان ڕاییکردووەو سەر ئێشەیان بۆ خۆیان دروست نەکردووە، نموونە بۆ ئەمانە (صلاح الدین الشهرزوري) بووە.

گروپی دووەم: ئەوانە بوون بەڕاشکاوی بیروڕاکانی خۆیان خستووەتە سەر قاقەزو بانگەشەیان بۆ کردوون، نموونە بۆ ئەمانەش (شهابەددینی سوهرەوەردی) بووە، بیروڕا فەلسەفییەکانی تێکەڵاو بە بیری زەردەشتی‌و

شەرقی (ئیشراقی) و یۆنانی کردووە، لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بووە، بە فیتی مەلا وشکەکان (صلاح الدین الأیوبي) لە سێدارەی دەدا، گەلێك کتێبی لە دوا بە جێماون بە تایبەتی کتێبی (من و وێت) واتە: (خۆم و خۆت)، یان کتێبی (زمانی سیمرخ)، بەداخەوە ناویان هەیەو خۆیان دیار نین، وەك لە پێشەوە وتمان خوێندنی حوجرە بۆ خزمەتی قورئان بووە، جا دەرچوون لەو مەبەستە بە گومڕایی دراوەتە قەڵەم.. ئیدی بۆیە هۆشمەندی وا هەڵنەکەوتووە خاوەن ڕێبازێکی هزری تایبەت بێت، ئێستاش هەر وایە!

**د. ئاراس: ئایا دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالیو مەولەویو مەحویو سالمو چەندانی دیکە بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

مامۆستا حەمە کەریم: دەرکەوتنی شاعیری گەورەی وەکو نالیو مەولەویو مەحویو بێسارانی... هتد، ڕاستەوخۆ بەرهەمی حوجرە نین، بەڵکو چەندین هۆکار هەبوون وا لەو شاعیرانە بکات لە بواری شیعردا بەرهەم بدەن، خوێندنی دیوانەکانی حافز و سەعدی شیرازی و وردە کتێبی دیکە قەریحەی ئەو کەسانەی تاوداوە کە سۆزو ئازار و غەمەکانیان لە دووتوێی شیعردا دەربڕن، خوێندنی ئەو وردە کتێبانە بەشێك نەبووە لە پرۆگرامی خوێندنی حوجرە، من ئەوەم لە کتێبی (مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا) ڕوونکردووەتەوە، بەڵێ گەلێ مەلا بوون بە شاعیر، بەڵام ئەوانە لە ڕای مەلاکاندا بە گومڕا دراونەتە قەڵەم من خۆم لە یادمە لە هەڵەبجە قانعی شاعیر لەلایەن مەلا گەورەکانەوە های و هوی لێکرا، چونکە شاعیرە! دوو بەیتەی نالیش شاهیدن کە دەڵێ: پێم دەڵێن خۆکوردیەو خۆ

کردیە... پڕۆگرامی حوجرە شتێکی وای تیا نییە باسی ئەدەب بکات، لای موسڵمانانیش شاعیر بە چاوێکی باش سەیر نەکراوە.

**د. ئاراس: حاجی قادری کۆیی و مەلای گەورەی کۆیە ئەو دنیابینی و نوێخوازییەی هەیانە بەرهەمی حوجرەیە، یان بەهۆی کاریگەربوونیان بە بزاڤی رۆشنبیری ئەوروپا، وەك حاجی قادری کۆیی لە ئەستەنبوڵ و کاریگەربوونی مەلای گەورە بە بیری قوتابخانەی ئیسلاحیی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەیە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: حاجی قادر و مەلای گەورەی کۆیە لە مەیدانی دنیابینییدا گەلێك جیاوازن، حاجی قادر دنیابینترو دیدفراوانتر بووە، حاجی قادر بە قوتابخانەی رۆشنبیری نەتەوایەتی ناسراوە، بە ئاشکرا هاواری بۆ گەلەکەی بەرزکردووەتەوەو دەرمانی دەردی کۆمەڵەکەی وێناندووە، لەگەڵ کاروانی بزاڤەکەدا بووە، کەچی مەلای گەورە هەندێك شیعری هەیە دژ بەدەروێش و کۆنەپەرستان لە دوورەوە تەنیا لەبەر خۆیدا ئەو شیعرانەی خوێندووەتەوەو نزیك بە کاروانەکە نەکەوتووە.. ئەگەر ئەو پایەو سامانەی مەلای گەورە هەیبووە هی حاجی بوایە، بە کردەوە شۆڕشێکی بەرپا دەکرد، هەردوو دنیابینییەکە لە حوجرەوە نەهاتوون، بەڵکو کاریگەری دەرەکی هاتووەو کاری لە هەردووکیان کردووە، هەرچەند من پێم ڕەوا نییە حاجیو مەلای گەورە بەراورد بکرێن.. ئەم مەسەلەیە لێکۆڵینەوەیەکی درێژخایەنی دەوێت.. مەلای گەورە وەکو مەلا بۆ ئەو زۆرە، ئەو کۆمەڵە شیعرەی هەیەتی

که بەڵگەی هۆشیاریەتی.. لەلایەکی دیکەشەوە (باب العالي) کۆشکی شاهانەی، لاپیرۆز بوون.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢ دانەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقى)م دەستکەوت و خوێندمەوە پەردە لەسەر چاو و دڵم لاچوو، لەبارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە" ئایا پرۆگرامی حوجرە ئەوەندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: راستە، پرۆگرامی حوجرە خوێنەری بەرەو پاشەوە دەگێڕێتەوە، نەك بەرەو پێشەوە، بەرەو پاشەوەکەش، نەك بۆ پاشەوەی کوردەواری، بەڵکو بەرەو پاش ئەوەی رۆژانی عەرەب، کەواتە گۆڤارەکە کاری لە (خاڵ) کردووە، نەك حوجرە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "لە ژێر کاریگەریی نووسینو بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانییدا کەوتمە بیری فەرهەنگ دانانو گرنگییدان بە زمانی کوردی"، بۆچی خوێندن و ژینگەی حوجرە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: ئەوەی خاڵ دەیڵێ، رای خۆیەتیو خۆی خۆی چاك دەناسێو راست دەکات، ڕاستیش نەکات هەر راکەی خۆی وەردەگیرێ.

**د. ئاراس: رێگرو کۆسپەکانی بەردەم بیری نوێخوازیی شێخی خاڵ چی بووە؟**

مامۆستا حەمەکەریم: شێخ محەممەدی خاڵ کەسێکی حکومی بوو، دیارە ئەوەی بە کۆسپی زانیوە تەنیا خەمی وەزیفەکەی بووە، ئەوەی من بیزانم کەس ناوی خاڵی بە خراپە نەبردووە، نووسینەکانی جێی ڕەزامەندیی خەڵك بوون، ڕەنگە لەبەر ئەوەبێت لە دامەزراندنو پەسەندکردنی مەلاکاندا دەستی

هەبووە، بۆیە مەلاکان بە خراپ ناویان نەبردووە، ئەوەی کردوویەتی بەشێوەیەکی بێدەنگو لەسەرخۆ بووە.

**د. ئاراس: بۆچی پرۆسەی پەروەردو زانستی ئایینی لە کوردستاندا نەیتوانیوە خۆی نوێبکاتەوە لەگەڵ گۆڕانەکانی سەردەمدا بچێتە پێشەوە؟**

مامۆستا حەمەکەریم هەورامی: پرۆسەی پەروەردەو زانستی ئایینی لە نوێخوازییەوە دووربووە لەبەر:

یەکەم: حوجرە هی لایەنێکی حکومی نەبووە، بەرنامەکانیشی دوانزە عیلمە بووە، ئەو دوانزە عیلمەیان داوەتە پاڵ ئایینو پێغەمبەرو ئیمامی عەلی، ئیتر چۆن گۆڕانکاری تیابکرێت، کێ ئەو گۆڕانکارییە بکات؟!

دووەم: لەناو مەلاکاندا هەر گۆڕاندنێك کە دەهات بە (البدعة) دەزانرا.

**د. ئاراس: بۆچی لەگەڵ هاتنی سیستمی نوێی خوێندن و قوتابخانەدا خوێندنی حوجرە پاشەکشەی کرد؟**.

مامۆستا حەمەکەریم: دوای ئەوەی کە قوتابخانە هاتە مەیدانەوە، ئیدی کەس منداڵی خۆی نەدەنارد بۆ حوجرە، کە لەسەر ڕاتبە و نان چنینەوە دەژیانو دەبوو ساڵەهای ساڵ بخوێنێتو ژیانی خۆی بەفیڕۆ بدا ئەوجا دەبوو بە مەلا، مەلاش نانو ژیانی لە سەر خەڵك بوو، ئەمڕۆ کێ ئەوە قبوڵ دەکات؟!.

**حەمەکەریم هەرامی**

**٢٩:١:٢٠١١**

**هەولێر**

## دیمانەی شەشەم

# دیداری مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم سەبارەت بە مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵو تێزە نوێخوازییەکانی

بەڕێز مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم نووسەرو قەڵەمێکی دیاری ناوەندی رۆشنبیریی کوردیە لەسەدەی رابردوودا، بەڕێزیشیان لە بنەماڵەیەکی ئایینیی دیارەو خوێندنو پەروەردەی لە مزگەوتەوە دەستیپێکردووە، ئاگاداری رەوشی خوێندنی حوجرەو بارودۆخی مەلا و فەقێ و ئاستی هۆشیاری و وبیرکردنەوەی ئەو توێژەی کۆمەڵگەی کوردەواریە، ئەوەندەی ئێمە بزانین بەڕێزیان ئاگاداری هەوڵو بۆچوونە ئیسلاحیی‌و نوێخوازەکانی شێخ محەممەدی خاڵو نووسین‌و تێزە فکرییەکانی ئەو زانا نوێخوازەیەو لە نزیکەوە ئاگاداری بیرکردنەوەو دنیابینینی ئەو زاتەیە و یەکتر بینین و بیرورِا گۆڕینەوەیان هەبووە، ئێمەش بۆ ئاگادار بوون لە زۆر لایەنی شاراوەی ژیانی رۆشنبیری شێخی خاڵو هەوڵە نوێخوازەکانی‌و بەربەستەکانی بەردەم پڕۆژە نوێگەرو ئیسلاحییەکەی خاڵ، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا:

١:٣:٢٠١١

سلێمانی

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا محەممەد پەیوەندیی بەڕێزتان‌و شێخی چۆن بووە؟ ئەو پەیوەندییە کەی دەستی پێکردووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: دەمەوێ لە داوێنی ئەو هەڵسەنگاندنەوە کە جەنابتان سەبارەت بە ئاگاداری من لە جۆری بیرکردنەوەو چالاکیی بیری خوالێخۆشبوو شێخ محەممەدی خاڵ کردووتانە، بەکورتی ئەوەندە بڵێم کە من نە بە تەمەن هاوڕێی شێخی خوالێخۆشبوو بووم و نە ئەوەندە لێیەوە نزیك بووم بەو پێیە بۆ ئەوە بشێم بە سەرچاوە بۆ هەڵسەنگاندنی بیری شێخی ناوبراو دانرێم.

من تەنها ٣ـ٤ ساڵێك تێکەڵییم لەگەڵی بووەو لە مەجلیسیدا دانیشتووم‌و شارەزاییەکی بە جۆرێکم لە جۆری بیروبۆچوونی ئەو پەیداکردووەو، بەم پێیە هەر لە چوارچێوەی ئەم واقیعەدا دەتوانم وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوەو، بە هەرحاڵیش بە هیوام بتوانم چەردەیەك سوودم بۆ ئەو پڕۆژەیە ببێ دەستتان داوەتێ و، بە ئاواتی ئەوەوەم لەگەڵ ئەوەیشدا وەڵامەکانم بێ سوود نەبن.

پێوەندی راستەوخۆی من لەگەڵ مامۆستای خاڵ لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥١ەوە دەستی پێکردووەو، تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٤ درێژەی کێشاوەو لەوەو پاشیش لە ساڵانی ١٩٧٠ وە تا ١٩٧٦ تازە بووەتەوەو هەر مانگی دووجار کە ئەو دەهات بۆ بەغدا بۆ بەشداربوون لە کۆبوونەوەکانی کۆڕی زانیاری کورددا من بە خزمەتی دەگەیشتم و ماوەیەك لەگەڵی دادەنیشتم، لەوەو پاشیش هەرچەند دەچوومە سلێمانی لە مزگەوتەکەی خۆیان دەچوومە لای.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ چۆن دەکەوێتە ژێر کاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحیی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدە؟ ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیە چ کاریگەرییەکی لەسەر شێخی خاڵ هەبووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: من لە کتێبخانەکەی مامۆستای خاڵدا زۆر کتێبم لە بارەی سەیید جەمالوددینی ئەفغانی و شێخ موحەممەد عەبدە و بیرو بۆچوونیانەوە دیوە، ئەمە لەو کاتانەدا بوو کە من ڕۆژانی سێ شەممە دەچوومەماڵیان بۆ ڕوونووس کردنەوەی کتێبی(البيتوشي) و (الشيخ معروف النودهي).

ئەو بۆخۆشی وتارێکی درێژی لەبارەی سەیید جەمالەددینی ئەفغانییەوە نووسیوەو لە یەکێك لە ژمارە پێشووەکانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوی کردووەتەوە.

زۆرجاریش گوێم لێ بووە بیروبۆچوونەکانی ئەو دوو زاتەی بەرز هەڵسەنگاندووە، هەروەها شێخی خاڵ گەلێ کتێبی وای هەبوو لەسەر جەمالوددینی ئەفغانی و شێخ موحەممەد عەبدەی لابوو، زۆریشیانی داوەتە لای من خوێندوونمەتەوەو بۆم گێڕاوەتەوە.

لە نووسینە ئیسلامییەکانیشیدا کە بەنیازی چاکسازی لە بواری ئایینیدا نووسیونی، تێکڕا سەیید جەمالوددین و شێخ محەممەد عەبدە وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی بیروبۆچوونە چاکسازییەکانییەتی.

د. ئاراس: بۆ بیرە نوێخوازەکەی شێخی خاڵ کاردانەوەو ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلاو ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان نەبووە؟

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: لام وایە هۆی ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شێخی خاڵ لە ژیانی ڕۆژانەیدا پاش بوونی بە قازیی شەرع و چوونەکاری حوکوومەتەوە، لە بواری کارو هەڵسوڕانی مەلاو فەقێکاندا هەڵنەدەسووڕا تا بیروبۆچوونیان لەگەڵ ئاڵوگۆڕ بکاو دەرفەتی کاریگەریی بۆ سەریان ببێ.

سەرەڕای ئەمەش، مەلا و فەقێ تێکڕا لەو سەردەمەدا سەر بەخوێندنگایەکی کات بەسەرچووی پاشکەوتوو بوون کە لەگەڵ ڕێبازەکانی سەید جەمالوددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەو خاڵ یەکیان نەدەگرتەوە.

لە هەموو ئەمەیش بەولاوە، بارودۆخی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا ئەوەندە پاشکەوتوو بوو کە بەهۆی نەبوونی پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی ژیانی کولتووریی مەلاو فەقێیانەوە لەگەڵ ئاوهەوای چالاکیی بیری شێخی خاڵ، دەرفەتی کاریگەرییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا نەبووە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ بۆچی کەمتر گرنگی بە توێژی مەلاکان داوەو زیاتر ڕووی لە ڕۆشنبیران کردووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: لام وایە ئەمە بۆ ئەو لێك ترازانەی بواری کاری مامۆستای خاڵ و مەلاو فەقێکانی سلێمانی و دەوروبەری دەگەڕێتەوە، سەرەڕای ئەمەیش، لام وایە شێخی خاڵ بۆ خۆیشی وەك تێکۆشەرێکی بواری ڕۆشنبیری نەهاتبووە کۆڕی ڕۆشنبیری مەلا و فەقێیانەوە تا بتوانێ کاریگەرییەکی لەم بوارەدا هەبێ.

**د. ئاراس: بەڕێزتان لە نووسینێکدا دەڵێن شێخ محەممەدی خاڵ کەوتووەتە ژێر کاریگەریی بیری شێخ محەممەدی کوڕی عەبولوەهاب، ئەو بۆچوونەتان لە کوێوە هاتووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: من ئەم ڕایەی خۆمم تەنها لە شیکردنەوەی بیروبۆچوونی شێخی خاڵەوە وەرگرتووە کە ناوبراو لە هەڵوێستیدا بەرانبەر بە دیاردەی بیروبۆچوونی خەڵك لە ئاست شێخان و شێخایەتی و تەوەسول (التوسل) و ئەم جۆرە بابەتانە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی وەهابییەکاندا نییە.

ئەمەیش وا ناگەیەنێ کە ئەو ئەم بیروبۆچوونەی لەوانەوە وەرگرتووە، چونکە کتێبەکانی شێخ موحەممەد ڕەشید ڕەزای قوتابی و هاوڕێی شێخ موحەممەد عەبدە پڕن لەم جۆرە ڕاو بۆچوونانە. لەگەڵ ئەوەیش کە شێخی خاڵ لام وایە تەنها بە مەبەستی چاودێرییکردنی بیروبۆچوونی ڕەشە خەڵکەکە و مەلا و فەقێیانی سەردەمیش ئەوەندە بایەخی بە خۆخەریککردن بە بەرهەڵستی کردنی ڕای گشتیی خەڵکەکە نەداوە.

ئەوەیشمان لە یاد نەچێ کە شێخی خاڵ خۆی لە بنەماڵەیەکی شێخە و باپیری خەلیفەی شێخ بەهائوددینی کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵە بووە، ئەمەیش بێگومان دەوری خۆی لە ئارامکردنەوەی خەباتی شێخی خاڵدا لە دژی شێخایەتی هەبووە، سەرەڕای بارودۆخی خودی شاری سلێمانی وەك شێخە شارێك و سەرەڕای خەریکبوونی بە وەزیفەی حکومەتییەوە، کە هەموو ئەمانە لە کۆڕی تێکۆشان بۆ ڕوونکردنەوەی پتری بیروباوەڕی چاکسازی کارییە ئیسلامییەکانی دووردەخستەوە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ لە سەدەی رابردوودا وەك مەلایەکی رۆژنامەنوس دەرکەوتووە، گرنگیی داوە بە بوای رۆشنبیری و خوێندنەوەی گۆڤارو رۆژنامە، ئەم هەوڵەی خاڵ لەلایەن توێژی مەلاو ناوەندە ئایینییەکانەوە چۆن سەیر دەکرا؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: شێخی خاڵ بەردەوام لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا دەینووسی و یەکێك بوو لە خاوەن قەڵەمە دیارەکان کە لە بواری چاکسازیی ئیسلامی و کۆمەڵایەتیدا قەڵەمی لە کاردا بوو.

من خۆم ئاگادار نیم، چونکە رۆژنامەکانی (ژین)و (ژیان)و (ژیانەوە)ی سەردەمی پیرەمێردم نەدیوە، بەڵام لام وایە چەندی پێکرابێت لەوانیشدا نووسیویەتی، لە کاتێکدا کە دیاردەی نووسین لە رۆژنامەو گۆڤاردا ــلەگەڵ کەمی رۆژنامەو گۆڤاریش لە کوردستاندا، لە ناو مەلا و فەقێکانی سلێمانیدا بەدی نەدەکراــ بەڵام من هیچ نیشانەیەکی دژایەتییکردنی لە رۆژنامەو گۆڤاردا نووسینی شێخی خاڵم لە ناو مەلاو فەقێیاندا بەدی نەکردووە.

من کەمتەرخەمیی ئەوانەم لەم بوارەداو چاولێکەرییەنەکردنیانم لە شێخی خاڵ تەنها بۆ پاشماوەی بیری کۆنەکاری لەناو مەلاو فەقێیاندا دەگێڕمەوە کە بە کارێکی بێ سوود و کات بەفیڕۆدەریان دەزانی، من خۆم کە حەزم لە رۆژنامە خوێندنەوە بوو، لە ساڵی ١٩٥٢ وەوە کە ماڵمان هاتە سلێمانی هەموو عەسرانێك دەچوومە دووکانی قادر ئاغای عەتار بۆ رۆژنامە خوێندنەوە، تا لە سلێمانی بووم فەقێیەکم لەوێ نەدیوە هاتبێ رۆژنامە بخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە فەقێی چاوکراوەو وریای زۆرمان هەبوو، رێکخراوێکی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتییان هەبوو و عەرزو حاڵی سیاسی و پیشەییان بە دەیان ئیمزا مۆر دەکردو لە رۆژنامە عەرەبییەکانی بەغدادا بڵاودەکرانەوە.

تێکرا لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا نووسینی شێخی خاڵ یەکێك بوو لە هەوڵدانە ئاشکراکانی ئەو بۆ کردنەبەری گیانی تازەگەری لەناو توێژاڵی مەلاو فەقێکاندا.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ بۆ نەیتوانی چەند مەلایەکی ڕۆشنفکری وەك خۆی دروست بکات؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: شێخی خاڵ سەری بە کاری قازییەتیی شەرعەوە گیرابوو، دەرفەتی تێکەڵاوبوونی لەگەڵ توێژاڵی مەلاو فەقێدا نەبوو، ئەمەمان لە چەند وەڵامی پێشوویشدا چەند جار وتووە، لە ئەزموونی ساڵانەی فەقێیاندا ئەوەی بەهەل دەزانی پرسیاری وایان لێبکات مێشکیان بەم جۆرە بابەتانەوە خەریك بکات، هەروەها لە تاقیکردنەوەی ئەو مەلایانەدا کە دەهاتن ببن بە پێشنوێژو دەرزبێژەوەو خوتبەخوێنی جومعە، پرسیاری وای لێدەکردن ڕایانبکێشێ بۆ بیرکردنەوە لە بابەتی نوێ، لەمە بەولاوە هەلێکی تێکەڵاوبوونی لەگەڵ توێژاڵی مەلایاندا نەبوو. ئێوارانیش کە کۆڕی دانیشتنی لە مزگەوتەکەی خۆیاندا (مزگەوتی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ) هەبوو، کەم مەلای وا هەبوون بچن لەو کۆڕەدا دانیشن، لەوێش بەهۆی جۆربەجۆریی ئەوانەوە کە دەهاتنە ئەوێ، کەم جار ڕێدەکەوت باس لەم جۆرە بابەتانە بکرێت.

**د. ئاراس: دیارترین کۆسپەکانی بەردەم پڕۆژەی نوێخوازیی و ئیسلاحیی شێخی خاڵ چی بووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: بیروبۆچوونی کۆنی جێگرتوو کە تێکۆشانێکی بێوچان بۆ ڕەواندنەوەی پێویست بوو، خۆتەرخاننەکردنی کەسانی هەڵگری بیروبۆچوونی نوێ، وەك شێخی خاڵ، بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە، لە پەنجەی دەست تێپەڕنەکردنی هەڵگرانی بیروبۆچوونی نوێ کە

هەریەکە لایەکی ئەم ئەرکە لەئەستۆ بگرێت بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵات دەرفەتی پەیدابوونی توێژاڵێکی وای نەدا بیری نوێ لە مێشکیاندا گەشە بکات. پاشکەوتوویی لە رادەیەکی دوورمەودای کۆمەڵ کە خەڵکەکە لە ناخی پێویستییەکانی خۆیاندا هەستیان بەناچاری بۆ گۆڕان نەدەکرد.

ئەمە پوختەی ئەو هۆیانە بوو دەرفەتی جێ پێ لەقبوونی بیری کۆنیان لە مێشکی خەڵکدا نەدەدا، کە ئەو دەرفەتەیش سەری هەڵدا گۆڕانەکە دەبوو بە ڕێبازێکی تردا بڕوا، وەك دیمان.

ئێستایش کەوا دیار دەدا (هۆشیاری)یەکی ئیسلامی سەریهەڵداوە، من لام وایە ئەم هۆشیارییە ئەوە نییە کە ڕێگە بێ و چاکسازییەکی بیری ئیسلامی و زیاتر تەوژمێکە بۆ دەستگیربوون لە چمکێکی دەسەڵاتی سیاسیو زیاتر لە لاساییکردنەوەیەکی لە دەرەوە هێنراو دەچێ، تا پێویستییەکی کۆمەڵگای موسڵمانی کورد.

**د. ئاراس: لە پێش شێخی خاڵدا کەسی دیکە هەوڵی نوێبوونەوەو ئیسلاحی ئایینی داوە لە کوردستان؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: کەسێکی دیاری جێ پەنجە دیاری ئەم بوارە، تەنها جەنابی مەلای کۆیەیە کە ئەویش جێ پەنجەی حاجی قادری کۆیی بە زەقی پێوە دیارە، گەورەترین بەرهەمی ئەویش کە تەفسیرەکەیەتی قورئانییەتی، پاش کۆچی دواییکردنی خۆی بە شەست ساڵ دەرفەتی گەیشتنە دەستی خوێندەوارانی بۆ هەڵکەوت، ئەویش لە بوارێکی زۆر لە پێویستیەکانی ئەمڕۆ تەسکتردا. من لام وایە کاریگەریی جەنابی مەلای کۆیەش بەر لەهەرچی، لە دەرزەکانیدایە کە بە فەقێکانی دەوتو زۆر لە

مەلاکان لەبەر کۆنەکارییان دژی دەوەستان، ئەنجا ئەو چەردە کەمەی شیعریەتی کە کەمێکی لە ژیانی خۆیدا بڵاوبووەتەوە.

**د. ئاراس: بەڕێزتان وەك محەممەدی مەلا کەریم چۆن بەرهەمەکان و تێزە فکرییەکانی شێخی خاڵ هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: تێکڕای بەرهەمەکانی شێخی خاڵ بە تەفسیرو کتێب و وتاری رۆژنامەیی و وتاری بوارەکانەوە بە ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسمانی تاریکی کوردەواریدا لە قەڵەم دەدەم.

ئاواتەخوازم لایەنێکی لێهاتوو هەموو ئەمانە کۆبکاتەوەو لە چاپیان بدا، هەروەها بە ئاواتەوەم ناوی لە یەکێك لە هۆڵەکانی زانکۆی سلێمانی بنرێت، چەند خوێندەوارێکی شارەزای بواری ئیسلامی تێزی دکتۆرای لە ژێر چاودێری مامۆستایانێکی لێهاتوودا لەسەر بنووسنو لە چوارچێوەی زانستێکی راستەقینەدا هەڵیسەنگێنن.

تێبینی: ئەم دیدارەی مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم بە دەستخەتی خۆی نووسیویەتیو هیچ جۆرە دەستکاری رێنووسو وشەیەکی نەکراوەو وەك خۆی تۆمار کراوە.

## دیداری دووەم

# لەگەڵ بەڕێز مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم سەبارەت بە بیری نوێخوازیی ئایینی لە کوردستان

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا محەممەد وەك بەڕێزتان ئاگاداربن، بیری نوێگەری ئایینی (التجدید الدیني) لە کوردستان هەبووە؟ کێ وەك یەکەم کەس هەوڵی نوێگەریی داوە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: من پێ بزانم، حاجی قادری کۆیی هەر لە کوردستانەوە بیری نوێگەری تێدا بووەو، بەر لەو مێژووە کەسی بۆ ناو نەبردووین بیری وای لە مێشکدا بووبێ.

**د. ئاراس: بۆچی خوێندنی حوجرەکان زیاتر کەسانی دەقبەستوو داخراوی دروستکردووەو نەیتوانیوە کەسانی ڕۆشنفکرو کراوە دروستبکات؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: لە کوردستانی خواروودا، چونکە پێش سەردەمی حاجی قادر گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی تێدا دەرنەکەوتووە بیرێکی تازە بە دوای خۆیدا بهێنێ، بەڵام کوردستانی باکوور، چونکە مەیدانی

کێشەی عوسمانی و ئێرانییەکان بووە، چەکەرەو بیری نوێ (لە شێوەی نەتەوەییدا) پەیدا بووە، کە لە شیعری ئەحمەدی خانیدا خۆی دەنوێنێ و، لە شێوەی کێشەی کۆمەڵایەتییشدا، تاڕادەیەك لە شیعری فەقێیێ تەیراندا دەردەکەوێ.

**د. ئاراس: لەگەڵ ئەوەشدا لە ناو پرۆگرامی حوجرەدا فەلسەفە خوێنراوە، بەڵام بۆ نەبووەتە هۆی پەروەردەکردنی کەسانی عەقڵانی و خەمخۆری خەمەکانی خەڵك لە کوردستاندا؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: رەنگدانەوەی نەبووە،چونکە ئەو مەلاو فەقێیانەی بە دەرز وتنەوەو خوێندنی فەلسەفەو عیلمی کەلامەوە خەریکبوون، بایەخیان تەنها بە لایەنە کۆنەکارو وشکەکانیان داوەو هەموو هەوڵی خۆیانیان بۆ بەرپەرچدانەوەی لایەنە عەقڵانییەکانیان (وەك بیری موعتەزیلەکان) تەرخان کردووە کە هیوای ئەوەیان لێدەکرا گۆمی مەنگی بیری کۆمەڵگای ئیسلامی بشەڵەقێنن و دەورێکیان لە سەرهەڵدانی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتییدا هەبێ ببێ بە مایەی دەرکەوتنی بیرێکی تازەگەریی لە بواری ئایینیدا.

**د. ئاراس: خوێندنی فەلسەفە زیاتر کەسانی عەقڵانی بیرکراوە دروست دەکات، بەڵام بەڕای بەرێزتان خوێندنی فەلسەفە رەنگدانەوەی هەبووە لەسەر کەسێتی مەلاکانی کوردستان؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: چونکە ئەو خوێندنی فەلسەفەیە لە دەرەتانێکی زۆر تەسکدا بووەو بەشبەحاڵی کەم کەس و، بۆیە دەرفەتی خولقاندنی ئەو ئەنجامەی بۆ کەس نەرەخساندووە بیر لەلایەنە

پێشکەوتووەکانی فەلسەفە بکاتەوەو، لە ئەنجامدا هیچ نیشانەیەکی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی لێوە پەیدا ببێ.

**د. ئاراس: ئایا دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالی و مەولەوی‌و مەحوی و سالم و چەندانی دیکە بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: دەرکەوتنی ئەو شاعیرانە، بێگومان بەرهەمی حوجرەو بە کاریگەریی شاعیران‌و شێوەی دەوروپشت‌و بەتایبەتی ئێران بووە، لەلایەکی ترەوە نیشانەی پەیدابوونی چەکەرەی بیری نوێی نەتەوایەتییە، چونکە بابەت و شێوەی شیعری ئەو شاعیرانە دیمەنێکی تازەی نەتەوەییان پێوەیە و هاوکات لەگەڵ دامەزرانی میرنشینیی باباندا سەری هەڵداوەو مۆرکی تایبەتیی ئەم میرنشینییەی پێوەیە.

**د. ئاراس: حاجی قادری کۆیی و مەلای گەورەی کۆیە ئەو دنیابینیی‌و نوێخوازییەی هەیانە بەرهەمی حوجرەیە، یان بەهۆی کاریگەربوونیان بە بزاڤی رۆشنبیری ئەوروپا، وەك حاجی قادری کۆیی لە ئەستەنبوڵ و کاریگەربوونی مەلای گەورە بە بیری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەدینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەیە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: نیشانەی ئەوە هەیە کە حاجی قادر هەر لە کوردستاندا ئەندازەیەکی زەق بیری نەتەوەیی تێدا پەیدا بووە، بەڵام گەشەکردن و دەرکەوتنی تەواوی لە ئەستەمووڵەوە دەستپێدەکات کە ئەنجامی پێوەندی پەیداکردنی بووە لەگەڵ کوردە کۆچکردووەکانی بابان‌و کوردستانی باکوورو تێکەڵبوونی بەو ئەندازەیەی شارستانەتی ئووروپا کە لە ئەستەمبوڵدا ڕەنگیداوەتەوە، هەرچی مەلای کۆیەشە نیشانەیەکی

دەرکەوتنی سەرەتای گۆڕان لە کوردستاندا و بە کاریگەریی بیری سەیید جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدەو هاوڕێکانیان.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خالٌ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢ دانەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقى)م دەستکەوتو خوێندمەوە پەردە لەسەرچاو و دڵم لاچوو، لەبارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە"، ئایا پڕۆگرامی حوجرە ئەوەندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: شێخ محەممەدی خالٌ هەرچەند لە خوێندنەوەی ژمارەیەکی گۆڤاری **(العروة الوثقى)**ی سەیید جەمالەددینەوە دەستی داوەتە تازەگەری ئایینی، بەڵام بێگومان بارودۆخی کوردستانی خوارووی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی وای لێکردووە بیری نوێی تازەکردنەوەی ئایینی چەکەرەی تێدا بکاو هەر ئەمەیشە وای کرد بەخوێندنەوەی تەنها یەك ژمارەی **(العروة الوثقى)** کانیی ئەم بیرەی تێدا هەڵتۆقێنێ.

کەواتە شێخ محەممەدی خالٌ بەرهەمی بارودۆخی نوێی کوردستانە، بەڵام بەهۆی ئالوودەبوونی بە ژیانی وەزیفەوە نەیتوانی لەسەر گەیاندنی پەیامە نوێخوازییە ئایینییەکەی بەردەوام بێ و وردە وردە لێی ساردبووەوە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خالٌ دەڵێت: "لە ژێر کاریگەری نووسینو بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانییدا کەوتمە بیری فەرهەنگدانانو گرنگییدان بە زمانی کوردی"، بۆچی خوێندنی حوجرە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: من لام وایە بیری کوردایەتیو فەرهەنگدانانو نووسینی کوردی شێخ محەممەدی خاڵ راستەوخۆ ئەنجامی خوێندنەوەی ئەو ژمارەیەی **(العروة الوثقى)**ی سەیید جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە نین، بەڵکو بەرهەمی بارودۆخی ئەو سەردەمەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئابووریی کوردستانن کە بە ئاشکرا هەوڵ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد دەدراو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم هۆیەو بیری ئەو دوو زاتەیش لە شێخی خاڵدا بەیەکدا شێلراونو ئەنجامەکەی پەیدابوونی موحاوەلەکانی ئەو، واتە شێخی خاڵ، یان لێ وەشایەوە لە بواری ئایینی نوێو کولتووری کوردیدا.

**د. ئاراس: بۆچی هەریەك لە مەلای گەورەی کۆیەو شێخ محەممەدی خاڵ نەیانتوانی وەك نوێخوازێکی ئایینی لەکاتی خۆیاندا دەربکەون؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: هەرچی مەلای گەورەی کۆیەیە لە رێگای تەفسیرەکەی ـ کە بەداخەوە لە سەردەمی خۆیدا لە چاپ نەدراـ و شیعرە رووناکبیرییەکانییەوە، کاری گەورەتری لە شێخی خاڵ کردووە لە کوردستاندا، بەڵام بەهۆی ئەوە کە ئەنجامێکی گەورە نەبەخشیێ، بە تێگەیشتنی من ئەمانەن:

أ: نەبوونی هۆ بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی، وەك رۆژنامەو گۆڤارو لە چاپدانی کتێبی وا کە ئەو بیروبۆچوونانەی تێدا شی بکرێنەوە.

ب: بوونی توێژاڵێکی گەورەی شێخو مەلای کۆنەکار کە بەرهەڵستیی بۆچوونەکانیان کردووە.

ج: نزیکی لە حوکوومەتو دەزگای داگیرکەرانی عێراقەوە کە هەرچەند ئەو بۆ سوودی وڵاتو گەلی بەکارهێناوە، بەڵام نەیارەکان کردوویانە بە مایەی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزانە لە دژی، بۆ سوودی کۆنەپەرستی.

هەرچی شێخی خاڵیشە، سەرەڕای هۆیەکانی لە ڕستەی پێشوو (أ ـ ب)دا وتران، من وای بۆ دەچم ئەو خۆی بەهۆی کاریگەریی دابونەریتی بنەماڵەکەیانەوە کە شێخی تەریقەت بوون، کاریگەرییەکی زۆری لە بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونە ئایینییەکانیدا بەخەرج نەداوە، سەرەڕای ئەمە چوونە ڕیزی وەزیفەی حوکوومەتیشەوە لە زۆر سەرەوە بووە بە کۆسپ لە ڕێگای چالاکی نواندندا بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونە ئازادەکانیو، جڵەوی چالاکی ئەوی بەلای نووسینی فەرهەنگ و وتارو هەندێ کتێبی عەرەبیدا بردووە.

## د. ئاراس: ڕێگرو کۆسپەکانی بەردەم بیری نوێخوازی ئایینی لە کوردستاندا چین؟

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: بەلای منەوە لە قۆناغی پاش جەنگی یەکەمی جیهاندا، لەبەر ئەوە کە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیو سیاسیی وا لە کوردستاندا پەیدا نەبوو بوو ڕیزێ پیاوی ئایینی ئازادبیر بخاتە کۆڕی تێکۆشانەوە بۆ هاتنەدی بیرێکی نوێخوازی ئایینیو دوو کەسی وەك مەلای گەورەی کۆیەو شێخی خاڵیش بەشی هێنانەدی ئەو ئەرکەیان نەدەکرد کە بە تەنها خۆیان لە عۆدەی ئەو ئەرکە قورسە بینی، بارودۆخی ژیانی مەلای کۆیە ئەو دەرفەتەی نەدایە کە لەوە زیاتری لە دەست بێ کە کردی، شێخی خاڵیش، نەك هەر تەنها بارودۆخەکە ئەو دەرفەتەی نەدا، بەڵکو تەنانەت خۆشی بۆ ئەوە

نەخوڵقابوو دەورێکی وەك ئەوەی مەلای کۆیە بگێڕێ، تەنانەت تەفسیرە تەواونەکراوەکەیشی زۆر لە تەفسیری مەلای کۆیە کەمتری لەباردا بوو، هەرچەندە تەفسیری هیچ کامیان وەك پێویست نەکەوتە ناو جەماوەرەوە.

لە قۆناغی دووهەمیشدا کە بزووتنەوەیەکی ئایینی لە کوردستاندا سەری هەڵدا، ئەو بزووتنەوە زیاتر دەنگدانەوەی بزووتنەوەی دەرەکی بوون، وەك بزووتنەوەی ئیخوانو کاشانیو پاشان خومەینیی، لە بریتیی ئەوەی بە مەبەستی نوێکردنەوەی بیری ئیسلامەتی بن، بەمەبەستی هاتنە جیهانێکی سیاسەت بوون کە پێوەندی راستەقینەی بە نوێکردنەوەی بیری ئیسلامەتیو هۆشیارکردنەوەی جەماوەری موسڵمانانەوە هەبێ.

لەبەر ئەوە، نە ئەو بزووتنەوانە زەمینەی تێدا سەرهەڵدانی بیری نوێی ئیسلامەتی بوونو نە کەسانی هەڵگری وای ئەم بیرە لە ئارادا هەبوون لەو زەمینەیەدا کاربکەن و لە ڕێڕەوی حزبایەتیی سیاسییەوە وەریگێڕنە سەر بڵاوکردنەوەی بیری نوێی ئیسلامەتی، بەڵام لێرەدا ئەوە دەوترێ کە لە بیری نوێی ئیسلامەتیشدا قەدەغە نییە لایەنی حزبایەتی بگرێتەبەر، بەڵێ، دەبێ ئەوە بزانین کە ئەرکی یەکەمی سەرشانی ئەم بیری ئازاد و نوێی ئیسلامەتییە ئەوەیە جەماوەری موسڵمانانی ئازادبیر بە ڕێبازی خۆیدا پەروەردە بکات، نەك ئەوە کە بچێتە کۆڕی ململانێیی سیاسییەوە، بە تایبەتی پێش ئەوەی توانیبێتی بنکەیەکی بەربڵاوی پانو پۆڕی جەماوەریی وا بۆخۆی پێبگەیەنێ کە بتوانێ بە دڵنیاییەوە بەرەو بەرپاکردنی سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامی بە شێوەیەکی هاوچەرخ دامەزرێنێ، ئەگینا بیەوێو نەیەوێ لەو ڕێڕەوە لادەدا کە ئیددیعا دەکا بۆ ئەوە هاتووە پیادا بڕوا.

بەلای منەوە قۆناغی سەرهەڵدانی بیری ئازادی نوێخوازی ئیسلامی سەردەمی بەسەرچووەو هەر تەقەلایەك لەم ڕێگایەدا بدرێ، سەرەڕای ئەوە کە ئەنجام بەخشیش نابێ، سەرنجامیش پەیڕەوانی، یان وازی لێدێنن، یان دەڕژێنە ئاوەڕۆی ئەو حزبایەتییەوە کە بەناوی ئیسلامەتییەوە کار دەکا.

من لام وایە ئەرکی ڕاستەقینەی ئەمڕۆی هەڵگرانی بیری نوێی ئیسلامەتی ئەوەیە لە بواری رۆشنبیریداو بەشێوەیەکی دیموکراتی هەوڵ بدەن بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو درۆو دەلەسە و سەرلێشێواندنانەی بەدەوری ئایینی ئیسلامدا بڵاودەکرێنەوە بەمەبەستی دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی گەشی ئیسلام لە کاروانی شارستانەتی مرۆڤایەتییدا.

**د. ئاراس: بۆچی لەگەڵ هاتنی سیستمی نوێی خوێندن و قوتابخانەدا خوێندنی حوجرە پاشەکشەی کرد؟**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: چونکە خوێندنی جارانی حوجرە لە خودی خۆیدا کەلەپوورێکی زۆر لە پاشی ساڵەهای بەسەرچوو بوو لە پاشکەوتووترین شێوەیدا، هەر هەوڵێکیش بۆ گەشەپێدانەوەی دەبوو لە ڕێگای دەزگایەکی کاریگەرەوە بێ کە گیانێکی نوێی بکا بە بەردا بۆ ئەم سەردەمە بشێ، ئەویش نەبوو، من بە هیواش نیم لەمەوپاش ببێ، چونکە کاروانی ئەمڕۆی خوێندن دەمێکە ئەو قۆناغەی بەجێهێشتووە.

**تێبینی: ئەم دیدارە مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم بەدەستی خۆی نووسیویەتی و بەبێ دەستکاری چاپم کردووە.**

١١:١:٢٠١١

ماڵی مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم

## دیمانەی حەوتەم

# دیداری لەگەڵ مامۆستا ڕێبوار عەلی

بەڕێز مامۆستا ڕێبوار عەلی وەك رۆشنبیرو نووسەرێکی نێو ئەدەبو رۆشنبیری ئیسلامیو ئاگادار لە بزاڤی زانستیو رووناکبیری ئایینی، ئەوەندەی ئێمەش ئاگاداربین بەڕێزیان هۆگری نووسینو تێزە رۆشنبیریو زانستییەکانی شێخ محەممەدی خاڵە و لە رێگەی نووسینو کۆڕگرتنەوە هەوڵی خوێندنەوەو ناساندنی کەسایەتی شێخی خاڵو بەرهەمەکانی داوە، خوازیاری ناساندنو زیاتر گرنگی پێدانی بیرو پرۆژە ئیسلاحیی‌و نوێخوازییەکانی ئەو زانا ریفۆرمخوازەیە، ئێمەش بۆ ئاگاداربوون لەو تێزو هەوڵە نوێخوازانەی لەلایەن پێشڕەوانی ئەو بیرەو مامۆستای خاڵەوەو دراون، ئەو ئاستەنگو بەربەستانەی بەردەم پرۆژە نوێگەریو ئیسلاحییەکەی خاڵو هاوڕێبازەکانی ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا:

٣٠:٤:٢٠١١

**د. ئاراس: بەڕێز مامۆستا ڕێبوار خوێندنەوەی بەڕێزتان بۆ تێزو نووسینەکانی شێخی خاڵ چۆنە؟**

م. ڕێبوار عەلی: بە بۆچوونی من ئەوەندەی خوێندنەوەم بۆ بەرهەمەکانی ئەو زانا رۆشنگەرە هەیە، دەتوانم لەم خاڵانەدا کۆیبکەمەوە:

یەکەم: فکری ئیسلامی کە کرانەوەو عەقڵانییەت رەنگدانەوەی تەواوی هەیە لەنێو نووسینەکانیدا هەیە، هەوڵی پێکەوە گرێدانی ئیسلامی داوە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمدا، بەڵگەی ئەم قسەیەشمان رەنگدانەوەی ئەو بۆچوونەیە لە نێو تەفسیری خاڵو وتارەکانی (ناڵەی دەروون)دا.

دووەم: لە بواری فۆلکلۆرو ئەدەبی کوردیدا، کە شێخی خاڵ وەك کوردێکی رەسەن کوردایەتی کردووەو هەستی کورد بوونو خزمەتکردن بە نەتەوەکەیو گرنگییدانی بە کەلتووری کوردیو زمانی کوردی لە نووسینەکانیدا رەنگیداوەتەوە.

خاڵ، وەك یەکەم کەس فەرهەنگی کوردی ـ کوردی نووسیوەو پەندی پێشینانو دەستنووسی زانایانی کوردی کۆکردووەتەوەو پاراستوونیو پێڕستی بۆ کردوون، گرنگی بە شیعرو ئەدەبی کوردی داوەو راڤەی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیو خاکیی کردووەو کۆمەڵێك وتارو بابەتی بە نرخی نووسیوەو لە هەردوو بەرگی (ناڵەی دەروون)دا کۆی کردوونەتەوە.

ئەگەر ئەو هەوڵو بیرکردنەوەی شێخی خاڵ وەك بیرێکی ئایینی ئیسلاحیی درێژەی پێبدرایەو هەواداری لێوەشاوەی هەبوایە دەکرا ببێتە قوتابخانەیەکی ریفۆرمی ئایینیو کۆمەڵایەتی رۆڵو کاریگەری زۆر ئیجابی لەسەر بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەی کوردەواری هەبوایە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك دەكەوێتە ژێر كاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحیی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە؟ ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیە چ كاریگەریەكی لەسەر شێخی خاڵ هەبووە؟**

م. ڕێبوار عەلی: رەنگە كۆنترین قوتابخانەی فكری ئایینی لە كوردستان دەكرێت ڕیبازە سۆفیگەرەكان بێت، وەك هەردوو ڕێبازی نەقشبەندیو قادری كە لە كوردستان ڕابەرو موریدو شوێنكەوتوویان هەبووە، بەڵام میتۆدو مێژوویان كەمتر نووسراوەو لێكۆڵینەوەی زانستیی لەبارەوە وەك پێویست نییە، لە پاش ئەوان، قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە دەگاتە كوردستانو كاریگەری لەسەر بیركردنەوەو ئاڕاستەی فكریی ئایینی هەندێك زانای وەك مەلای گەورەی كۆیەو شێخ محەممەدی خاڵو كەسانی دیكە، هەبووە.

مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ لە نووسینێكیدا دەربارەی ژیانو تێزە فكرییەكانی سەید جەمالەددینی ئەفغانی دەڵێ: خوێندەوارانی رۆژهەڵات گۆڤاری (**العروة الوثقى**) بە دیاری بۆ یەكتر دەنارد، بە جۆرێكی وەها ئەو گۆڤارەیان كردبووە سەرمەشقی خۆیان، لەبەر ڕووناكیەكەی دادەنیشتن، بەپێی فەرموودەو فەرمانەكانی دەجوڵانەوە، تا لە ماوەیەكی كەمدا بیروباوەڕی زۆر لە خوێندەوارانو زانایانو دانایانی گۆڕیو زۆر نووستووی بێداركردەوەو مردووی زیندووكردەوە، كە یەكێكیان زانای بەناوبانگ سەید محەممەد رەشید رەزای خاوەنی تەفسیری (مەنار)ە كە خۆی لەلاپەڕە ٨٤م١

کتێبی (تاريخ الأستاذ الامام الشيخ محمد عبده)دا باسی دەکات، یەکێکی دیکەیان خۆمم (مەبەست شێخ محەممەدی خاڵ)ە.

هەر لەژێر کاریگەری بیری قوتابخانەی ئیسلاحیی شێخ محەممەد عەبدەدا و لە ڕێڕەوی ئەو، شێخی خاڵ لە ساڵی ١٩٣٤دا تەفسیری جزمی (عم)ە دەنووسێتو لە چاپخانەی (ژین) لە سلێمانی چاپی دەکات، لە ساڵی ١٩٣٨ وەك یەکەم کوردێك کتێبی (فەلسەفەی ئایینی ئیسلام) دەنوسێت لە سلێمانی چاپی دەکات.

شێخی خاڵ لە ژێر کاریگەری هەمان قوتابخانەو تێزە فکرییەکانی جەمالەددینی ئەفغانیدا لە ساڵی ١٩٦٠دا فەرهەنگی خاڵ دەنووسێتو لە سلێمانی لە چاپی دەدات، ئەمەش وەك یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ کوردی لە مێژووی زمانی کوردیدا، لە پێشەکی ئەو فەرهەنگەدا خاڵ لە وتارێکدا لەژێر ناوی (فەلسەفەی یەکێتی کۆمەڵو زمان) باسی گرنگیی زمانو فەرهەنگ دەکاتو لە پەراوێزیدا دەنووسێت: "بەشی زۆری لە وتارێکی فارسی سەید جەمالەددینی ئەفغانی وەرگیراوە".

**د. ئاراس: بۆ بیرە نوێخوازییەکەی شێخی خاڵ کاردانەوەو ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلاو ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان کەمبووە؟**

م. ڕێبوار عەلی: کەمی کاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحیی شێخی خاڵ لە سەر مەلا و ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان بە بۆچوونی ئێمە نامۆبوونی نووسینی ئایینی بە کوردیو گۆڕانو نوێبوونەوە کارێکی زۆر سەخت بووە بەلای مەلای کوردەوەو دابڕان و دوورییان لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان، کەمتر

گرنگییدانیان به خوێندنەوەو خۆرۆشنبیرکردن لەلای مەلای کورد وای کردووە کەمتر بکەونە ژێر کاریگەری بیری تازەوە، شێخی خالیش زیاتر لەو بوارەوە کاری کردووەو ئەمە یەکێك بووە لەو فاکتەرە گرنگانەی کەوای کردووە تێزە فکرییەکانی کاریگەری لەسەر ناوەندە ئایینییەکان نەبێت.

بێگومان گۆڕانو کاریگەرییش وردە وردەو زۆر لەسەرخۆ دەستپێدەکات، ئەوەتا لە دوای شێخی خالی تەفسیری قورئان بە کوردیو نووسینی ئایینی کوردی سەرهەڵدەدات، وەعزو وتاری ئایینی لە رۆژانی جومعەدا دەبێ بە کوردی، هەتا لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو تەواو ئەو کاریگەرییە دەردەکەوێتو نووسینو کۆڕو سیمنار زۆر دەبن، بەڵام کێشەکە لەوەدایە لەدوای قۆناغی شێخی خاڵەوە نووسەرانێك کە خاوەنی تێزی فکری نوێ بن دەرناکەون کە لە ئاستی شێخی خاڵدا بن، ئەو نووسەرە کە گەنجانەش دەرکەوتن زیاتر گیرۆدەی کاری حزبییو ململانێی سیاسی بوونو زۆربەی رۆشنبیرە ئیسلامییەکانیش هەتا ئێستا لە بازنەی تەقلیدو گەڕانەوە بۆ دواوەدان، نەگەیشتوونەتە ئاستی بیرکردنەوەی شێخی خالی.

**د. ئاراس: شێخی خالی تا چ ئاستێك لە نوێبوونەوەی وتاری ئایینی کاریگەری هەبووە؟**

م. ڕێبوار عەلی: هەروەك محەممەد عەمارە باس لە کاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحیی محەممەد عەبدەو هاوڕێکانی لەسەر نووسەرانی میسر دەکات، دەڵێ: قوتابخانەی ریفۆرمی جەمالەددینی ئەفغانی کە رەوتی زیندووکردنەوەو نوێبوونەوە بوو، کاریگەری هەبوو لە سەر بزاڤی ئایینیو رۆشنبیرانی جیهانی ئیسلامی بە گشتی.

کەواتە ئەم قوتابخانە و تێزە فکرییەکانی چۆن کاریگەری لەسەر جیهان هەبووە، بەهەمان شێوەش کاریگەری لەسەر کوردستان هەبووە، بە تایبەتی لە سیەکان‌و چلەکانی سەدەی رابردوو کە بزاڤی رۆشنبیری‌و خوێندەواری لە کوردستان پێشدەکەوێت‌و هەندێك خوێندەوارانی کورد روو لە میسر دەکەن.

**د. ئاراس: دیارترین کۆسپەکانی بەردەم پڕۆژەی نوێخوازی‌و ئیسلاحیی شێخی خالْ چی بوون؟**

م. ڕێبوار عەلی: ڕەنگە بتوانین گرنگترین کۆسپەکانی بەردەم ریفۆرمی ئایینی شێخی خالْ لەم خالانەدا کۆبکەینەوە:

یەکەم: نەبوونی هاوکارو زانای لێهاتوو لەگەڵ شێخی خالْدا هەتا بتوانن هاوکارو تەواوکەری یەکتر بن‌و هەموو ئەرکەکە نەکەوێتە سەر شانی تاکەکەسێك کە رەنگە کارێکی وەها گران بە کەس‌و دوو کەس نەکرێت، هەروەك لە وڵاتی میسر هەریەك لە جەمالەددینی ئەفغانی‌و محەممەد عەبدەو رەشید رەزا تەواوکەری یەکتر بوون‌و پڕۆژەکەیان درێژە پێدا.

دووەم: سەرقاڵی شێخی خالْ بە وەزیفەی حکومییەوەو چوونە بواری قەزاوەت لە شوێنە جیاوەزەکانی کوردستان وایکردووە کەمتر بواری هەبێت خەریکی پڕۆژە فکریی‌و ئیسلاحیە ئایینییەکەی بێت، هەر لەم رووەوە لە کاتی خۆیدا پیرەمێردی شاعیر بە قەسیدە شیعرێك گلەیی و گازەندەی لێدەکات.

سێیەم: بوونی هەژموونی دواکەوتووی دەروێشگەرایی‌و بیری دواکەوتووی ئایینی رێگری سەرەکی بەردەم بیری نوێخوازی شێخی خالْ بوون لە سیەکان‌و چلەکان‌و پەنجاکانی سەدەی رابردووداو پاش ئەو مێژووەش

دەرکەوتنی ئاراستەی دیکەی ئایینی کەمتر نەوەی نوێ ڕوویان لە تێزە فکرییەکانی شێخی خاڵ کردووە.

سێیەم: دەرنەکەوتنی نووسەرو رۆشنبیری وەها کە کاریگەریان هەبێ لە بردنە پێشەوەی ڕەوتی ریفۆرمی ئایینیو نەبوونی قوتابخانەو ناوەندی زانستیی وەها بتوانن بە بیرێکی نوێی زانستیەوە تەفسیری ئایین بکەنو بتوانن کاریگەرییان لە سەر بیرکردنەوەو دینداری خەڵکی هەبێت.

چوارەم: هەستنەکردنی نووسەرانو رۆشنبیرانی ئیسلامی بە گرنگیو پێویستی بیری نوێخوازی زەرورەتی ئیسڵاحی فکری ئیسلامیو چوونە پێشەوە لەگەڵ بزاڤی شارستانیو گۆڕانی ژیانی کۆمەڵگەدا و سووڕانەوە لە بازنەی داخراوی رابردوو، خۆقەتیسکردنی لە تەفسیری مەلایانەدا بۆ ئایینو رەوتی ژیانو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان، هەموو ئەمانە هۆی داخران و پاشکەوتنی بیری ئایینیو پاشەکشەی بیری ئیسڵاحی ئایینین لە کوردستاندا.

**د. ئاراس: لە پێش شێخی خاڵدا کەسی دیکە هەوڵی نوێبوونەوەو ئیسڵاحی ئایینی لە کوردستان داوە؟**

ڕێبوار عەلی: بە بۆچوونی هەندێك لە نووسەران، کاریگەری قوتابخانەی ریفۆرمی ئیسلامی جەمالەددینی ئەفغانی، پێش شێخی خاڵ هاتووەتە کوردستان و باس لەوە دەکەن کە هەریەك لە حاجی قادری کۆیی و مەلای گەورەی کۆیە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەو قوتابخانە ئیسڵاحیە، هەروەك مەلا محەممەدی شارەزووری لە کتێبی (داروین لە تەرازووی ژیریدا)دا ئاماژەی پێدەدا.

## دیمانەی هەشتەم

# لەگەڵ بەڕێز پڕۆفیسۆر دکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسوڵ سەبارەت بە بیری نوێگەری ئایینی لە کوردستان و هەوڵە نوێخوازییەکانی شێخ محەممەدی خاڵ

بەڕێز پڕۆفیسۆر دکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسوڵ ئەکادیمیو کەسێکی دیاری ناوەندی ڕۆشنبیری کوردییە، نووسینو توێژینەوەکانی لەنێو بزاڤی ڕۆشنبیری کوردییدا جێگەی ستایشە، بەڕێزیان کەسێکی مەلازادەو لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا لە دایك بووەو سەرەتای پەروەردەو خوێندنی لە مزگەوتو حوجرەوە دەستپێکردووە، ناوبراو خوێندنەوەی زانستییو تێزی دکتۆرای لەسەر بیری شاعیرێکی وەك خانی وەرگرتووە کە دەتوانرێت بە پێشەنگی بیری نەتەوایەتیو کۆمەڵایەتی دابنرێت لە مێژووی کورددا، ئێمەش بۆ شرۆڤەکردنو خوێندنەوەی ئەو مێژووە دوورو درێژەو ئاگاداربوون لە بیری نوێخوازییو هەوڵە نوێگەرەکانی هەریەك لە حاجی قادری کۆییو مەلای گەورەو شێخ محەممەدی خاڵ کە تا چەند توانیویانە وەك نوێگەرو ئیسلاحخوازی ئایینی دەربکەونو.. کۆسپو ئاستەنگەکانی بەردەم پڕۆژە ئیسلاحییەکەیان.. ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا وەك کەسێکی ئاگاداری ئەو مێژووەو ڕۆشنبیرو ئەکادیمیەکی ئاگاداری ڕەوتی بزاڤی ڕۆشنبیری کوردیو ئاڵوگۆڕو گۆڕانکارییەکانی ئەو بزاڤە، بە تایبەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی رابردوودا.

د. عیززەددین: سەرەتا، پێش هەموو شت شێخ محەممەدی خاڵ بەو بەرهەمانەی بۆی بەجێهێشتووین لە چەند مەیدانێکی وشەی کوردییدا، یان بە عەرەبی لەبارەی زانایانی کوردەوە وەك شێخی نۆدێو مەلای بێتووشی ناوی بە گەورەیی چووەتە نێو مێژووی کوردەوە، بەڵام لە مێژوودا هەرکەسە و هەر پیاوە گەورەیە، جێگەی خۆی هەیە و دەبێ هەقی خۆی بدرێتێ، لەبەر ئەوە حاجی قادری کۆیی بەتایبەتی جێگەیەکی گەورەی لە مێژووی کورددا هەیەو مەلای گەورە جێگەیەکی دیکەی هەیە و شێخ محەممەدی خاڵ جێگەی خۆی هەیە کە لەوان جیاوازە رەحمەتی شێخی خاڵ سنوورێکی لە ژیانی خۆیدا و لە نووسیندا بۆ خۆی داناوەو پێی نەناوەتە ناو سیاسەتەوە، کە حاجی تەواو جیایەو ڕابەرێکی سیاسی کوردایەتییەو بۆ باسی مەلای گەورە شتێکی دیکە دەڵێین.

**د. ئاراس: بەڕێز جەنابی دکتۆر، خوێندنەوەتان بۆ مێژووی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا چۆنە؟**

د. عیززەددین: خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا، واتە لە مزگەوتدا، هەر خوێندنی ئایینی نەبووە، لەوەی خەڵك، یان مەلا وتەنی (عەوام) بە دوانزە عیلمی ناوی دەبەن (کە لە دوانزە عیلم زیاترە)، هەر فیقە (شەرع) دەچێتە ناو خوێندنی ئایینی یەوە، ئەوانی تر ئەو زانستانەن کە لە جیهاندا هەبووەو خوێندراون، بەڵام لە سنووری بیری ئیسلام دەرنەچوون، ئەگەر خوێندنو خوێندەواری لە کوردستاندا هەبووبێت لە مزگەوتەوە هاتووەتە دەرێ. لە دوو کەوانەدا (ڕوشدیەی عەسکەری) عوسمانییەکان جیا دەکەینەوە، تا

کاتی حوکمڕانیی مەلیك مەحموود کە قوتابخانەی تازەو سەردەمیی کردەوە.

**د. ئاراس: وەك بەڕێزتان ئاگادارین، بیری نوێگەری ئایینی (التجدید الدینی) لەکوردستان هەبووە؟ کێ وەك یەکەم کەس هەوڵی نوێگەری ئایینی داوە؟**

د. عیززەددین: هەر چەندە زۆر دەستنووس ونبوونو سووتاونو چاپ درەنگ هاتە کوردستان، لەبەر ئەوە هەموو ئەوانەی کتێبیان داناوە شتێکی تازەیان پێبووە، بەڵام دیارترینیان لای من مەولانا خالیدە کە هەر خۆی لەقەبی (المجدد)ی داوە بەخۆی، کە ئەمەش راستە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك دەکەوێتە ژێر کاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەدینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە؟ ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیە چ کاریگەرییەکی لەسەر شێخی خاڵ هەبووە؟**

د. عیززەددین: شێخی خاڵ لە تەفسیرەکەیدا دەردەکەوێ کە خۆی سەر بە شێخ محەممەد عەبدەو جەمالەددینی ئەفغانی دەزانێت، چونکە (جزمی عەمم)ەکەی هەر وەرگێڕانی وشە بە وشەی تەفسیرەکەی محەممەد عەبدە و لەوانیتریشدا سێبەری تەفسیری (المنار)ی پێوە دیارە، کە شێخ محەممەد رەشید رەزا لە دەرسەکانی محەممەد عەبدەوە وەریگرتووە، وەك خۆیشی دەفەرمووێ خوێندنەوەی ژمارەیەکی (العروة الوثقی)ی سەید جەمالەددینو محەممەد عەبدە کاری تێکردووەو سەرسامی کردووە.

**د. ئاراس: بۆ بیرە نوێخوازەکەی شێخی خاڵ کاردانەوەو ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلا و ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان کەم بووە؟**

د. عیززەددین: شێخی خاڵ زیاتر بە دانانی (فەرهەنگ)ە بە نرخەکەیەوە خەریك بوو ـ کە بە کارێکی مەجمەعانە دەژمێرێتو زۆر کەسی بۆ کۆکردنەوەو نووسینەوە خستەکار، لە ڕووی ئایینەوە ئەو خۆ لە سیاسەتو حزبایەتییەوە دوورخستنەوەیە بوو بە کۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا کە وەك رابەرێك بچێتە ناو خەڵکەوە.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا ئاستێك لە نوێبونەوەی گوتاری ئایینی کاریگەری هەبووە؟**

د. عیززەددین: بێگومان بەپێی رۆژی خۆی نوێخواز بووە، بەڵام وەك مەلای گەورەی کۆیە نەچووەتە ناو کارەکەوە.

**د. ئاراس: ئایا هەوڵی نوێکردنەوەی ئایینی زەرورەتێکی ئەو کاتو سەردەمە بووە، یان زیاتر لە ژێر کاریگەری دەرەکییدا ئەو هەوڵانە دەرکەوتوون؟**

د. عیززەددین: نوێکردنەوە هەمیشە کارێکی ناوەوەو پێویستەو کاری دەرەکی، یان وێنەی دەرەوەی نوێکردنەوە سەرنج ڕادەکێشیو کەسانی لێهاتوو بەرەو نوێکردنەوە بەپێی کات شوێنی وڵات دەبات، ئەمە لە شیعری کوردیدا لە هەموو شتێك دیارترە.

**د. ئاراس: خوێندنی فەلسەفە چەندە کاریگەری و ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر دنیابینی و بیری مەلاکانی کوردستان؟**

د. عیززەددین: مەلای کوردستان زیاتر بە زانستی (کەلام ـ عەقایدەوە) خەیکبووە، کە لای من جۆرێکە لە فەلسەفە بە بۆچوونی ئیسلامیو بە بۆچوونی قورئانو حەدیسو رەنگە بڵێم دامەزرێنەری ڕاستەقینەی (غەزالی)یە.

**د. ئاراس: ئایا دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالیو مەولەویو مەحویو سالمو چەندانی دیکە بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

د. عیززەددین: بێگومان پێش ئەم شاعیرە گەورانە خانیو مەلای جزیریو ئەوانی دیکەیش هەبوون، کە مەلا بوونو ئەمانەی ناوت هێنانو رابەرن هەر مەلا بوونو لە مزگەوتدا خوێندوویانەو ئەدەبی فارسیو عەرەبی کاری تێکردوونو خوێندنی مزگەوت بە شاهیدەکانی ئەلفیەوەو بە بەلاغەتەوە هەوێنی شاعیرانەیانیان پتەوکردووەو بوون بەو رابەرانە.

**د. ئاراس: حاجی قادری کۆییو مەلای گەورەی کۆیە ئەو دنیابینییو نوێخوازییەی هەیانە بەرهەمی حوجرەیە، یان بەهۆی کاریگەربوونیان بە بزاڤی رۆشنبیری ئەوروپا، وەك حاجی قادری کۆیی لە ئەستەنبوڵو کاریگەربوونی مەلای گەورە بە بیری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدەیە؟**

د. عیززەددین: جارێ با وشەی حوجرە راست بکەمەوە، خوێندنی حوجرە لە کوردستاندا بەو پلەیە وتراوە کە پێش بوون بە (فەقێ) لە دەرەوەی مزگەوت خوێندراوە، لە مزگەوتیشدا (حوجرە) بە مانای ژوور وتراوە، ژووری فەقێکان، یان مامۆستا، ئەویتر خوێندنی مزگەوتە. ئینجا با

بێمە سەر حاجی قادر کە وێنەی نوسخەی (خانی)یە لە چەرخی خۆیدا و دیارە شیعرەکانی لە ئەستەمبووڵ نووسیوە کە ئەوسا تائێستاش ئاسیا و ئەوروپا لە هەموو ڕوویەکەوە بە یەکەوە دەبەستێت. حاجی زادەو بیرکەرەوەی ئەوسای ئەستەمبوڵە و لەوێ ئاگاداری جیهان بووە، بۆ مەلای گەورە کاریگەری ئەو رابەرانە و خوێندنەوەیان دیارە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢ دانەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقى)م دەستکەوت و خوێندمەوە پەردە لەسەرچاو و دڵم لاچوو، لەبارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە"، ئایا پڕۆگرامی حوجرە ئەوەندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

د. عیززەددین: دیارە شێخی خاڵ حەزی بەوە کردووە بچێتە ناو جیهانی نوێوە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "لەژێر کاریگەری نووسین و بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانییدا کەوتمە بیری فەرهەنگدانان و گرنگییدان بە زمانی کوردی"، بۆچی خوێندن و ژینگەی حوجرە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

د. عیززەددین: خوێندنی مزگەوت دوورتر بووە لە جیهانی ئەدەبییەوە، بەڵام بۆچی بیری سەید جەمالەددین بەرەو فەرهەنگ نووسینی بردووە، ڕەنگە بەرەو خزمەتی کورد بێت لەو ڕێگەیەوە.

**د. ئاراس: بۆچی هەر یەك لە مەلای گەورەی کۆیەو شێخ محەممەدی خاڵ نەیانتوانی لەکاتی خۆیاندا وەك نوێخوازێکی ئایینی دەربکەون؟**

د. عیززەددین: مەلای گەورەی كۆیە تا ڕادەیەك دەركەوتووە، بەڵام ئاگام لە هەوڵی شێخ محەممەدی خاڵ نییە لەو بارەیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زرووفی كوردستانو عێراق ئەو مەودایەی نەداوە بە هیچ نوێخوازێك، یان ئەو هەموو كۆچكردنەی سەید جەمالەددینو محەممەد عەبدە كردوویانە، ئەمانە نەچوونەتە ژێر ركێفی سەختییەوە.

**د. ئاراس: ڕێگرو كۆسپەكانی بەردەم بیری نوێخوازی شێخی خاڵ چی بوون؟**

د. عیززەددین: ئەگەر خۆشی هەوڵی دابێ، ئەوە دیسان زرووفەكەو بیری كۆنی هەندێك مەلا كۆسپ بوون.

**د. ئاراس: پەیوەندی نێوان مەلاكانو ڕۆشنبیرەكان، بەتایبەتی بیری چەپ چۆن بوو لەگەڵ دەركەوتنی بیری تازەو چەپایەتی لە كوردستان؟**

د. عیززەددین: دەزانن زۆربەی ڕووناكبیرە تازەكانو هەڵگرانی بیری چەپ لە مزگەوتەوە هاتوون، دەتوانم بۆتان بژمێرم كە چەند لە سەركردەكانی حزبی شیوعی عێراقو كوردستانیش مەلا، یان كوڕە مەلا بوون، جارێك لە بیرمە یەكێك لە سەلەفیەكانی ئێستا لە مامۆستا مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی پرسی، گوایە تۆ مەلایت؟ ئیجازەت وەرگرتووە؟ وتی: بەڵێ مەلام ئیجازەم هەیەو ئیجازەشم داوە.

**د. ئاراس: شاعیرێكی وەك بێكەس لە چلەكاندا سكاڵا لە دەست گوتاری مەلاكان دەكاتو دەڵێت:**

**ئەی مەلا تۆبی و خودا لەم فكرە كۆنە لابدە**

**باسی قەبرو مار بگۆڕە وەرە سەر باسی وەتەن**

**ئەمە بەڵگەی داخرانی بیری مەلاکان‌و گوتاری ئایینی نییە؟ یان ململانێی نێوان بیری رۆشنبیری نویٚ و گوتاری ئایینی نییە؟**

د. عیززەددین: دیارە بێکەس لەگەڵ چ جۆرە مەلایەکیەتی، هەر بێکەسیش پێوەندی بە زۆر مەلاوە هەبووە لە کاری کوردایەتییدا، لە حزبی یەکێتی‌و برایەتیدا. بڕوانە (پێشەکی عەلائەددین سوجادی بۆ دیوانی سەفوەت) ئەوەی بێکەس ململانێی وشکە مەلا و رووناکبیرانە.

**د. ئاراس: لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی رابردوو رۆشنبیرو خوێندەواران زیاتر روو دەکەنە بیری چەپ‌و پشتکردنە ئایین، ئەگەر تێزە نوێخوازییەکانی خاڵ، یان نوێکردنەوەی بیری ئایینی هەبوایە دەکرا ئەو دوورکەوتنەوە روونەدات؟**

د. عیززەددین: بیری چەپ لە ڕووی فەلسەفییەوە لەگەڵ ئایدیالیزمدا ڕێکنەکەوتووە، بەڵام هەر لە نووسینی لێنیندا دیارە کە چەپ نابیٚ هەستی ئایینداریی خەڵك بریندار بکات، خۆزگە ئەمزانی تێزە نوێخوازی یەکانی شێخی خاڵ کامانەن، چونکە تەفسیرەکانی زۆر بڵاو نەبوون؟!.

**د. ئاراس: بەڕێزتان وەك دکتۆر عیززەددین چۆن بەرهەمەکان‌و کەسێتی شێخی خاڵ هەڵدەسەنگێنن؟**

د. عیززەددین: بەرهەمەکانی زۆر بەنرخن، کۆششی زۆر هێناونیە بەرهەم، بە تایبەتی سیٚ بەرگی فەرهەنگەکەی.

## دیمانەی نۆیەم

# دیداری مامۆستا نەبەز هەورامی

بەڕێز مامۆستا نەبەز هەورامی شاعیر و نووسەرێکی نێو کایەی رۆشنبیری ئیسلامی و ئاگادار لە بزاڤی زانستیو روناکبیری ئایینی کوردیە، ئەوەندەی ئێمە بزانین بەڕێزیان خوێنەری هەوڵو بۆچوونە ئیسلاحیو نوێخوازەکانی شێخ محەممەدی خاڵە، لەو بوارەشدا نووسین و دیدارو کۆڕو کۆبوونەوەی هەبووەو حەزی لە بەردەوامی سەرکەوتنی پڕۆژەی نوێکردنەوە کردووە، ئێمەش بۆ ئاگادار بوون لەو تێزو هەوڵە نوێخوازانەی لەلایەن پێشڕەوانی ئەو بیرەو مامۆستای خاڵەوەو دراون و کاریگەریو گرینگیان، هەروەها ئاستەنگو بەربەستەکانی بەردەم پڕۆژە نوێگەریو ئیسلاحیەکەی خاڵ و هاوڕێبازەکانی، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا:

۱۳:٦:۲۰۱۱ سلێمانی

**د. ئاراس: خوێندنەوەی بەڕێزتان بۆ کەسایەتی و تێزو نووسینەکانی شێخی خاڵ چۆنەو بەرهەمو کەسێتی ئەو زانا بەهرەمەندە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: من کە بە بەرهەمو نووسینی شێخی خاڵ ئاشنا بووم، هەر زوو هەستمکرد لەگەڵ عەقڵێکی گەورەو هەڵگری خەمێکی گەورەدا بەرخورد دەکەم، نووسینەکانی ئەو تایبەتمەند و جیاواز بوون، هەوڵی پڕۆژە و هەڵگری ئاڵای بزاڤێکی نوێکردنەوە بوون، بۆم دەرکەوت ئەو کەسێك بووە توانیوێتی گوتارێکی ئایینی گونجاو بۆ سەردەمی خۆی بەرهەمبهێنێت، عەقڵیەتی ئایینیی خاڵ بە رای من پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو، ئەوەی ئێستا لای لایەنە ئیسلامییەکان لە بارەی مەدەنییەتو میانەڕەویو پێکەوەژیانو گرێدانی خەمو خەونی ئایینی بە نەتەوەو نیشتمانەوە ئامادەیی هەیە، لای ئەو پێش زیاتر لە نیو سەدە و لە سەرەتای بیرکردنەوەیەوە ـ بە نووسینو هەوڵدان ـ بوونی هەبووە، لەو رۆژگارەدا کە تازە رەنگو بۆنی عەلمانییەتو جیاکردنەوەی ئایین لە کایە گەورەکانی ژیان لە بڵاوبوونەوەدا بوو.

شێخی خاڵ خوێندەوارو رووناکبیرێکی گەورە، بەڵکو رۆشنگەرێکی سەردەمەکەی خۆی بووە، بێجگە لە رۆشنبیری ئایینی، لە بزاڤی رۆشنبیریو زانستی وڵاتانی دەوروبەر بە ئاگا بووە، بەتایبەت لە بەرهەمو بیری زاناو گەورە نووسەرانی وڵاتی میسر، کە لەو رۆژگارەدا میسر لە ناو وڵاتانی رۆژهەڵاتدا بزاڤێکی زانستی و ئەدەبی و رۆشنگەرانەی تێدا بووە، پێوەندی نامە گۆڕینەوەشی لەگەڵ هەندێ لە زاناو نووسەرەکانی ئەو وڵاتەدا هەبووە،

وەك (مەحموود ئەمین‌و محەممەد فەرید وەجدی‌و عەققاد و شەلتووت‌و..هتد).

لە ڕووی گرێدانی خەمی نیشتمانیی و ئایینییەوە، لە ڕووی بایەخدانی بە زمان‌و ئەدەب‌و فەرهەنگ‌و مێژووی نەتەوە بەو قوڵییە، ئەو هەڵکەوتووی نێو زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووەو جیاواز لەوان بیری کردووەتەوەو جوڵاوە، وەك شێخ خالیدی کوڕی‌و سەرچاوەی دیکەش ئاماژەی پێدەکەن، ئەو نیشتمانپەروەریی بە خواپەرستیی زانیوە و چەندین وتاری لە بارەی ژێردەستەیی کوردو ستەمکاریی دوژمنەکانی نووسیووە و ئاگاداری دەردو نەهامەتیە هەمەجۆرەکانی نەتەوەکەی بووە، وەك زانایەکی پایەدار و هەستکردووش بە ئەرکی زانایەتی، هەم هاواری دڵسۆزانەی لێ هەڵساوە، هەم ڕێنمایی و ڕێگەچارەشی خستۆتەڕوو.

لە سەردەمی شیخی خاڵدا مامۆستایانی ئایینی بەشێکیان گۆشەگیری حوجرەو زانستەکانی بوون و خۆیان لە کۆمەڵ‌و خەڵك‌و خەمەکانی بەدوورگرتووە، بەشێکیشیان لەوانەی کە خاوەنی قەڵەم بوون، یان جوڵەی ڕۆشنبیری‌و سیاسییان هەبووە، کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بیری چەپ‌و ئایین‌و ئاییندارییەکەیان لە تاقی مزگەوتدا بەجێهیشتووە، بەڵام خاڵ وەك زانایەکی هۆشیار زانیویەتی ئایینەکەی هەروەك ئایینی مزگەوت‌و حوجرەو لایەنی روحیە، ئایینی نێو جەستەی کۆمەڵ‌و مەیدانی کارو تێکۆشان‌و ڕێگەی پیشکەوتنیشە.

لای زۆرینەی مەلای ئەو سەردەمە جۆرێك لە پابەندبوون بە خوێندەوارییەکی تەقلیدیی حوجرەوە ئامادەیی هەبووە - بەبێ

خۆپێشخستن‌و بەئاگابوون لە دەوروبەر ـ بەڵام ئەو ئاشنای هێندێك لە زانستە سروشتی و مرۆییەكان و تیۆرە تازە دەركەوتووەكان‌و كایەی فیكر بووە، بەبێ ئەوەی ئەمە وای لێبكات هەستە ئایینییەكەی كاڵ بكاتەوە، بە پێچەوانەوە، ئەو هۆشیاری و ئاگاداربوونەی بە پێویستیەكی ئایینی‌و تەواوكاری هەنگاوە رۆشنبیرییەكانی زانیوە.

بایەخدانی ئەو وەك زانایەكی ئایینی بە فەرهەنگی زمان‌و پەندی پێشینان‌و دیوانی شاعیران‌و زۆر جومگەی ژیانی كۆمەڵایەتی گرنگ، لای من جێگەی سەرنج بوو، چونكە ڕاستە ئەدەب و زمان لای حوجرەو مامۆستایان بایەخدار بووەو شاعیرەكانمان تا قۆناغی مامۆستا گۆران پەروەردەكراوی كەشوهەوای حوجرەن، بەڵام هەر لە نێو حوجرەشدا زۆر كەس هەبوون بە چاوێكی كەم سەیری زمان‌و فەرهەنگو ئەدەبی خۆیانیان كردووەو پێیان نەنگیی بووە ئاوڕی لێبدەنەوە، یان بە جۆرێك لە دەمارگیرییان زانیوە.. بەڕاستی لەم ڕووەوە خاڵ لەو قۆناغەدا ئەو كەلێنە دروستكراوەی نێوان ئایین‌و فەرهەنگی نەتەوەیی‌و لە لایەكی دیكەوە دین‌و دونیا و كۆمەڵگەی لەلای خۆیەوە سڕیەوە.

لە ڕووی چۆنێتی رێكخستنی پەیوەندی رۆشنبیرانە و زانایانەش لەگەڵ دەسەڵاتدا، پێوەندییەكی دروست‌و بەرپرسیارانەی هەڵبژارد، وەك دەزانین زۆرجار ئەو پێوەندیە لای هەندێك زانا و نووسەر دروست‌و بەرپرسیارانە نییە، ئەو بەرانبەر بە دەسەڵاتی رژێمە حوكمڕانەكانی عێراق ـ بە تایبەتی ڕژێمی دیكتاتۆرییانەی بە پەندبووی بەعس ـ خاوەنی كۆمەڵێك هەڵوێستی زانایانە و رۆشنبیرانە و كوردانە بووە، بەعس لەزۆر رێگەوە هەوڵیداوە شێخی

خاڵ بخاتە نێو داوەوە، بەڵام ئەو چیایەك بووە لەبەردەم تەماع وەبەرنانو هەڕەشە ناراستەوخۆکانیدا، شێخ وێڕای بەرزیی پلە و پایەی بنەماڵەکەیو پلە وپایەی زانستیو کۆمەڵایەتی خۆی، ئەگەر ویستبای بەزۆر پایەی بەرزی دەوڵەتییش دەگەیشت، بەڵام نەیویست، چونکە دەیزانی بەوە دەبێ ئازادیی خۆی لەدەستبدا و لە پڕۆژە رۆشنبیرییەکانیشی دوور بکەوێتەوە.

(لە نووسینێکی خۆماندا لە ١٩٩٢دا و شێخ خالیدی کوڕیشی لە وتارێکدا لە ژمارە ٢٩ی گۆڤاری گەلاوێژی نوێ ـ حوزەیرانی ٢٠٠٢ـ دا لە هەڵوێستەکانی دواوین).

لەڕووی پێوەندی بە دەوروبەری خۆیەوە، پێوەندی بەردەوامی لەگەڵ هەموو رۆشنبیران و نووسەرانی کوردا دا هەبووە بە جیاوازی ئایدۆلۆژیا و بیرو ڕایانەوە، بە تایبەت نووسەرانی گەورەی وەك ئەمین زەکی بەگو تۆفیق وەهبی و پیرەمێردو بێکەسی شاعیر و..هتد، هەر بە پلەو پایەی زانایەتی و بە جلوبەرگی مەلایەتیشەوە سەرۆکایەتی لقی سلێمانی یەکێتی نووسەرانی کردووە! حوجرەکەشی هەمیشە جمەی هاتووە لە نووسەران و رۆشنبیران، لە کاتێکدا زۆربەی ئەوانە نەوەیەك بوون خۆیان بەنەوەی پاش ئیسلامەتی و نەوەی پێشکەوتن و عەلمانیی ڕەنگ دەزانی، دەتوانین بڵێین لای هەندێك خەڵکی ئیسلامی بۆ ئێستەش ئەمجۆرە پێوەندیە لەگەڵ رۆشنبیراندا، نزیك بە سنوورەکانی حەرامە.

ئەمە بە گشتی لە ڕووی کەسێتیەوە، لە ڕووی بەرهەم و نووسینیشەوە، وەك دەزانین ئەو بە زۆر بارو لە زۆر بواردا قەڵەمی تاو دەدا، ئەمەش ئەگەر بەڵگە بێت، لەسەر شتێك، بەڕای من بەڵگەیە لەسەر گەورەیی خەم و خەونی

ئەو، گەورەیی بیرو پرۆژەی شێخی خاڵ لە ئاستێکدا بووە، پێویستی بەو هەموو کایانەی نووسین هەبووە.

لە بواری ئایینیدا سەرەتا دەستیدایە گرانترینو هەستیارترین بوار کە بواری تەفسیرە بە زمانی کوردی، کە بوارێکی، نەك هەر دەست بۆ نەبراو، بەڵکو دەست بۆ بردنیشی لای هەندێك کەس بە جۆرێك لە لادان لە دین بۆی دەڕوانرا، زمانەکەشمان بە شایستەی ئەوە نەدەزانرا کە تەفسیری پەیامێکی وەك قورئانی پیرۆزی پێبکرێت، خاڵ بەو ڕچە شکاندنە هەم خزمەتی بە ئاییندارى کردو هەم بە زمانی کوردی، ئەوەی دەرخست کە زمانەکەمان شایستەی ئەوەیە تەفسیری پێبکرێت، بە تەفسیریش کۆمەڵێك زاراوەو چەمكو مانای قورئانیی هەمەجۆری هێنایە نێو زمانەکەمانەوە، لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە وەك نموونەی تەفسیری سەردەم پشتی بە تەفسیرەکانی محەممەد رەشید رەزاو عەبدەو سەید قوتب بەستبوو، تەفسیرەکەی ـ ئەوەندەی زانستی تەفسیر بوار بدات ـ بە رۆحێکی سەردەمیانە نووسیبوو، وەك خۆی لە دوا چاوپێکەوتنیدا دەڵێ: (بە زمانێك کە لای لاوانو نەوەی نوێ وەرگرتنی ئاسان بێت). (رۆژنامەی عێراق ـ ژ ٩٩ ـ ٢:٨:١٩٨٩).

ئەمە بێجگە لەوەی ماناکانی تێکۆشانو چاکسازیو پێشکەوتنی زیاتر تێدا دەرخستبوو، بە گشتی خاڵ قورئانی وەك سەرچاوەی شۆڕشێکی فیکریو مەعریفیو زانستی زانیوە، شۆڕشێك کە گۆڕانکاری گەورە بە دوای خۆیدا بهێنێت، وەك لە وتارێکیشیدا بە ناونیشانی (بیگۆڕن تا خواش بیگۆڕێ )دا لەو بارەوە دواوە.

لەبارەی میتۆدو تایبەتمەندی تەفسیرەکەیەوە لەم دواییانەدا ماستەر نامەیەك نووسراوە.

لە پاش تەفسیر، لە کایەی نووسینی ئایینیدا کۆمەڵێك کتێبی دیکەی نووسین کە هەر یەکێکیان لە هەوڵی چارەسەری کێشەیەکدا بوو، بەردەوامیش وتاری ئایینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیری و ئەدەبی بۆ گۆڤارو رۆژنامەکان دەنارد (کۆی وتارەکانی لە سێ بەرگدا بە ناوی ناڵەی دەروونەوە کۆکراونەتەوە).

لە بواری فەرهەنگو کەلەپووریشدا، سەرەتا دەستیدایە پڕۆژەیەکی گەورەو گران کە نووسینی فەرهەنگی زمانی کوردی بووە بەناوی فەرهەنگی (خاڵ)ەوە، من نازانم لە بارەی گرنگیو گەورەیی ئەم پڕۆژەیەوە چی بڵێم، چونکە هەم کاتی بڵاوبوونەوەی فەرهەنگەکەو هەم پاشتریش کۆمەڵێك زانا و نووسەری گەورەی وەك تۆفیق وەهبیو د. مارف خەزنەدارو هەژار موکریانیو محەممەدی مەلا کەریمو.. هتد، نرخاندوویانە، ئەوەندە بەسە کە بڵێم فەرهەنگەکەی سەرەتا و بناغە بوو بۆ فەرهەنگەکانی پاش خۆی، هەر لە بواری پاراستنو گەشەپێدانی فەرهەنگی نەتەوایەتیدا و بەمەبەستی ناساندنی مێژوو و جوگرافیا و بەرزیی ئاستی زانستییو زانستخوازیی کورد (لەچەند قۆناغێکدا) بە گەلانی دی، بە زمانی عەرەبی کتێبی لەبارەی ژیانو بەرهەمی گەورە زانایانی وەك شێخ مارفی نۆدێو بەیتوشیو شێخ ئەحمەد فائیزی بەرزنجەییەوە نووسی، بە ساغکردنەوەو لەسەر نووسینی بەرهەمی هەمەدانییو خاکیو شیخ رەزای تاڵەبانیو مەلا حەمدوونو.. هتد، خەمخۆریی خۆی بۆ ئەدەبی نەتەوەکەی گەیاندە لوتکە.

لە سەروو ئەمانەشەوە توانی لە ژیانی خۆیدا کتێبخانەیەکی گەورەو گرنگی دەستنووس ـ وەك ئەمانەتێکی گەورەی فەرهەنگیی کە لە بنەماڵەکەیەوە گەیشتبووە دەستی ـ بپارێزێ و دەوڵەمەندیشی بکات، لە کاتێکدا چەندین جار گەورەترین تەماعی فرۆشتنی وەبەر نراوە ـ بەتایبەت لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە ـ سەددام حوسێن– لە ڕێگەی نوێنەری خۆیەوە داوای دەسنووسەکانی کردبوو لەبەرانبەر چەکێکی کراوەی بانقدا..(وەك شێخ خالیدی کوڕی لە دیدارێکی نێوانماندا لە ٥ـ٨ـ١٩٩٢دا بە درێژی باسی بەسەرهاتی دەسنووسەکانی کرد) دیارە پاراستنی دەسنووس لای خاڵ هەڵقوڵاوی هەستێکی ئایینی و نەتەوەیی بووە و بەرانبەر بە هیچ شتێك ئەو هەستەی نەلەخشاوە.

قسەکردن لەسەر بەرهەمی ئەو، کات و دەرفەتی زۆری دەوێت، نەك هەر کتێبێکی، بەڵکو هەر وتارێکی ئەوە دەهێنێ لەسەری بووەستیو دەیان لاپەڕەی لەسەر بنووسی، بە نموونە با ئاماژە بە وتارێکی بکەین بە بۆنەی ساڵی تازەوە، کە لە لاپەڕە ٨٧ ی چاپی یەکەمی بەرگی دووەمی (ناڵەی دەروون)دا بڵا وبووەتەوە و وتاری هەینییش بووە، لەو وتارەدا زۆر بە کوڵو لە دڵەوە بەرانبەر بە ناکۆکیو دووبەرەکیو خوێنڕشتنی یەکدی هاواری دڵسۆزانەی لێهەڵساوەو هەمووانی ڕووبەڕووی بەردەرگای خوای گەورە کردۆتەوە، پاشان هەر لە وتارەکەدا لە دەست فێڵکردنو درۆزنییو بێ بەڵێنیی کاربەدەستان بەرانبەر بە گەل بێزاریی دەردەبڕێتو دەڵێت: (تا کەی گەل هەڵخەڵەتاندن بە بەڵێنی درۆو دەلەسە و وتەی بۆشو پف هەڵدراو، هەر دەستەیەك تا نەهاتۆتە سەرکار، هەزاران بەڵێنی زلزل ئەدات،

کەچی کە لەگەڵ هاتە سەرکار لە دەستەکەی خۆیان خراپتر دەردەچن، خوایە! شۆڕش هەڵگیرساندن وەك ئاگر هەڵگیرساندن ئاسانە، بەڵام هەڵسووڕاندنی لە قازانجی گشتیو سوودی کۆمەڵەدا گرانە..)!.

ئەمجۆرە زمانە لە وتارداندا، زمانی پەرۆشییەکی قوڵە بۆ گۆڕانکاریو چاکسازی، لە کۆتایی وتارەکەشدا برایەتیو تەباییو هاوکاری دەکات بە ئاوات بۆ ساڵی نوێ، شێخ لە هەموو قۆناغەکانی شۆڕشی گەلەکەیدا لە روانگەی قورئانەوە باسی لە ستەمو ستەمکارییو روایەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکارانو قەبوڵنەکردنی مەزلوومیەت کردووە ـ بە تایبەت لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولەوە ـ بەڵام هەمیشەش ـ وەك ئاماژەمان پێکرد ـ تەباییو یەکڕیزی گەلی بە هەوێنی سەرکەوتن زانیوە.

ئەگەر تەنیا سەیری ناونیشانی وتارەکانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت شێخ چەند قوڵو بەرپرسیارانە بیری کردۆتەوەو چەند مەبەستێکی ئینسانیی گەورە لە پشت وتارەکانییەوە ئامادەیی هەیە، ئەمە ناونیشانی هەندێك لە وتارەکانێتی: (دادی کۆمەڵایەتی، فەلسەفەی ئەدیان "بە پشتبەستن بە خوێندنەوەی کتێبی چەند فەیلەسووفێکی رۆژئاوایی")، (فەلسەفەی یەکێتی کۆمەڵو زمان)، (هەستی ناتەواوی).. و کۆمەڵێك ناونیشانی دیکە..

ئەمانە و چەند لایەنێکی دی لە ژیانی ئەودا بوونە هۆی سەرسامبوونی من بەو کەسایەتیە گەورەیە، بۆیە بە ئاوات بووم دەرفەتێك بێتە پێشەوە بتوانم لە لێکۆڵینەوەیەکدا وێڕای هەڵوێستو خزمەتەکانی، سەرچاوەی رۆشنایی بیری ئەو بدۆزمەوە، بۆ یەکەمجار ـ لەدوای راپەڕینەوە ـ لەسەر نووسینو بیرکردنەوەی شێخی خاڵ بابەتێکی موتەوازیعانەم نووسی، بابەتەکە لەژمارە

(٨) ساڵی ( ١٩٩٢)ی گۆڤاری (رابەر)دا بڵاوبۆوە (رابەر ئەو دەم یەکێك بوو لە گۆڤارەکانی سەرەتاکانی قۆناغی پاش راپەڕین)، لە ساڵانی دواتریشدا لە دوو کۆڕدا لە سلێمانیو هەڵەبجەی شەهید لەسەر ژیانو بەرهەمو کەسایەتی ئەو، بابەتم پێشکەشکرد.

ئەڵبەت قسەکردن لەسەر خاڵ لە ساڵانی سەرەتای پاش ڕاپەڕینەوە بەو مەبەستە بوو کاروباری نوێی ئیسلامییو نەوەی ئیسلامیی پاش ڕاپەڕین ئاوڕ لە کارو بەرهەمی زانا و موسڵیحێکی نەتەوەکەی بداتەوە، بە تایبەت لە ڕووی ئاوێتەبوونی هەستی ئایینیو نەتەوایەتیەوەو لە رووی خزمەتکردن بە زمانو فەرهەنگەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لە کاتێکدا لای گەورە نووسەرانو رۆشنبیرانو زانایانی وەك جەمال بابان و محەممەد عەلی کوردیو ئەمین زەکی بەگو پیرەمێردی شاعیرو، زۆری دیکە، خاڵ بە زانای گەورەو بە (متبحر) ناوبراوە، ئێمە ناڵێین کەسێکی پڕ کەماڵو بێ خەوش وخاڵ بووە، چۆنێتی گەیاندنی پەیامو هەندێك لە بیروبۆچوونیشی ـ بە تایبەت لە تەفسیرەکەیدا ـ ڕاو بۆچوونی جیاواز لە بارەیانەوە هەیە، بێگومان مرۆڤ کە پڕکارو زیندوو بوو، هەڵەش دەکات، ئەوە مرۆڤە مردووەکانن کە ناکەونە هەڵەوە، خۆیشی هەر بەمشێوەیە بەرهەمی خۆی پێشکەش کردووە، لە پێشەکی وتارەکانی ناڵەی دەروونیدا بەم بەیتەی حاجی قادری کۆیی ئەو هەستەی دەربڕیوە:

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن

ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما

نەك هەر ئەمە، هەر بە بەیتێکی دیکەی حاجی قادر، ئەو نووسەرو رۆشنبیرو ئەدیبە ناخاتە سەرووی رەخنەوە، هەروەها دەبێ ئەوەشمان لەبەر چاو بێت کە ئەو جۆرە کەسایەتییانە لە سیاقی زەمەنیو لە واقیعی زەمینەی خۆیاندا قەڵەمی رەخنەو هەڵسەنگاندن بە دەوریاندا بسووڕێت.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك دەکەوێتە ژێر کاریگەری قوتابخانەی ئیسلاحیی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدە ؟ ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیە چ کاریگەریەکی لەسەر شێخی خاڵ هەبووە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: لە ساڵی ١٩٣٢دا، پاش بینینو خوێندنەوەی هەر هەشت ژمارەکەی گۆڤاری (العروة الوثقی) کە ئەفغانیو محەممەد عەبدە لە پاریس دەریاندەکرد، خۆی ئاماژە بە گۆڕانکاریەکی گەورە دەکات، گۆڕانکارییەك کە دوایی لە بیرکردنەو هەڵوێستو لە سەرجەم نووسینەکانیدا رەنگدانەوەی هەیە، نەك هەر لە نووسینە ئایینییەکانیدا، بەڵکو بایەخی ئەو بە رۆشنبیری و زمانی کوردیو فەرهەنگی زمانو پاراستنی دەسنووسیش، هەر لەژێر ئەو کاریگەرییەدا بووە، وەك خۆی دەڵێت: "هۆی بنەڕەتیی کاریگەر لە جیهانی رۆشنبیریی مندا نووسینەکانی جەمالەددینی ئەفغانی بوو، لە وتە جەمالیەکاندا بۆم دەرکەوت کە زمان گیانی میللەتە، کە زمان هەبوو گەل هەیە، ئەو دوو ڕستەیە رایانچەڵەکاندم" – دوا چاوپێکەوتن– پاشکۆی عێراق.

هەروەها باس لەوە دەکات کە ساڵانێکی زۆری تەمەنی بۆ خوێندنو فێربوونی هەندێك کتێبی زمانو کەلام و مەنتیق تەرخان کردووە، پاش ئەوە

بە پێویستی زانیووە شارەزایی لە زانستی هاوچەرخ و زمانەوانیدا هەبێت.. پاش ئەم وتەیەی خۆی ئیتر پێویست بەوە ناکات تەفسیری دیکە بۆ ئەمجۆرە خزمەتەی (خالّ) بکرێت، بەداخەوە، لای هەندێك كەس تا ئێستاش وەزیفەی ئایین بە وەزیفەیەکی زۆر بەرتەسك دەزانرێت کە دەبێ تەنیا لە دروشمو سرووتی ئایینیدا بەرجەستە ببێت، ئیدی خەمی خاكو خەڵك، خەمی زمانو فەرهەنگ، گوایا خەمی کەسانی دەرەوەی بازنەی ئایینە! ئەوەتا هەر لەدوا چاوپێکەوتنندا بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری ئەوەی لێدەکرێت: "چۆنە زانایەکی ئایینی دەچێتە مەیدانی فەرهەنگو زمانی نەتەوەوە؟!" وەك بڵێی پێشتر زانایانی ئایینی لەم رووەوە هیچ خزمەتێکیان نەکردبێت!.

لە کۆتایی وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەتوانم بڵێم: شێخی خالّ بایەخی بە هەموو ئەو کەناڵانەدا کە ئەفغانیی گرتبوونییە بەر بۆ گەیاندنی بیروبۆچوونە تەجدیدییەکانی، وەك کایەی رۆشنبیری و رۆژنامەگەریو زمانو فەرهەنگ و ڕەوانبێژیو هونەری وتاردانو ئەدەب، تەنانەت لە پێوەندیشیدا بە نووسەرانو رۆشنبیرانەوە لە ژێر کاریگەری ئەودا بوو، بەڵام لە سنووری هەلومەرجو زەمینەی کوردستاندا، بە کورتی کاریگەرییەکە روونو ئاشکرایەو خۆیشی لە چەند دیدارو چاوپێکەوتنیکدا ئاماژەی پێکردووە.

**د. ئاراس: بۆچی بیرە نوێخوازییەکەی کاردانەوەو رەنگدانەوەی لەسەر مەلاو ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان کەمبوو، یان بە گشتی دیارترین کۆسپەکانی بەردەم پڕۆژەی نوێخوازیی و ئیسلاحی شێخی خالّ چی بوون؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: لەم سەرەتایەوە بە گونجاوی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم هەندێك سەرچاوە بۆچوونیان وایە بۆ ئایینی ئیسلام، لە بری (نوێگەریو نوێخوازیی) وەها گونجاوترە نوێکردنەوە (تجدید) بەکارببرێت، چونکە ئەم چەمکە هەر خۆی لە ناو هەناوی ئایینو ئایینی ئیسلامدا بوونی هەیە.

پێش ئیسلام هاتنی پەیامی ئاسمانی بە دوای یەکدا بۆ هەر زەمینو زەمانێك، خۆی لە خۆیدا نوێکردنەوە بووە، لەئایینی ئیسلامیشدا نوێکردنەوە بە فەرموودەیەك ئاماژەی بۆ کراوە، لە واقیعی ژیانی سەردەمی خەلافەتیشدا لە چەند قۆناغێکدا ڕەنگیداوەتەوە، ئیجتیهادیش وەك بەشێك لە نوێکردنەوە لە چەند سەردەمێکدا پرۆسەیەکی بەردەوام بووە، ئەگەرچی لە هەندێك سەردەمدا وەستاوە، بێگومان هەردوو چەمکی (ریفۆرمو چاکسازیی)ش بۆ کایەی فیکرو رۆشنبیری ئایینیو تەرزی ئاییندارییو بواری کۆمەڵایەتیو بواری دیکە، گونجاون.

بێمە سەر وەڵامی پرسیارەکەت.

بە گشتی من هۆی سەرەکی بۆ نەبوونو نەسازانی زەمینە دەگێڕمەوە، ئەگەر هەر بەنموونە سەیری ئەو زەمینەیە بکەین کە بۆ سەید جەمالەددینی ئەفغانی سازا، بۆ خاڵ نەسازا، سەید پوختەی بەرنامەو پرۆژەکەی لەو کاتەوە زیاتر خەملا کە لە ماوەی ساڵانی (١٨٧١ــ ١٨٧٩) لە میسر بوو، میسری ئەو رۆژگارەش لە رووی سیاسیەوە زەمینەی لە بار بوو بۆبڵاوبوونەوەی بۆچوونەکانی، یەکسەر لە ئاستی سەرەك وەزیرانی ئەو دەمەدا (ریاز پاشا) پشتیوانی لێدەکرێت، ریاز پاشا هەستی کردووە ئەفغانی

وەك: موسلّیحو رۆشنبیرو بانگخوازو وتاربێژێکی گەورە بوونی لە میسر تێنو تەوژمێکی گەورە بە کاروباری سیاسیو کۆمەڵایەتی وڵات دەدات، بێجگە لەوەش میسر لەو کاتەدا زۆر خۆی بە ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانی نەدەزانی، بەڵکو ململانێشی لەگەڵدا دەکرد، سەیدیش کە لە ئەستەمبووڵەوە ڕەهەندەی میسر کرابوو، میسری ئەو قۆناغە لە بەرانبەر ئەوێدا لە خۆگرتنی ئەوی بە پێویست دەزانی، دەتوانین بڵێین ئەمە یەکێکە لە درەوشاوەترین قۆناغەکانی ژیانی ئەو.

ئەفغانی لەوێ هەر زوو هەوڵیدا کار لەسەر پیگەیاندنی کۆمەڵێك قوتابی بکات تا دوایی ببنە کەناڵی بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی، وەك نووسەرو زاناو رۆژنامەنووس، ئەوەبوو زانایانی وەك: محەممەد عەبدە و محەممەد رەشید رەزای پێگەیاندو بە زوویی بوونە پایەی بینای پەیامەکەی، لەڕووی سیاسییشەوە سەعد زەغلول و مەحموود سامی باروودی و کەسانی دی.

ئەفغانی سەرەتا ماڵەکەی خۆی کردە قوتابخانەیەکی گەورە، پاشان لە دەرەوەی ماڵیش لە قاوەخانەیەکدا بەردەوام کۆمەڵێکی زۆر لە رۆشنبیرو ئەدیب و رۆژنامەنووسو سیاسی گەورە لە دەوری جەم دەبوون، هەروەها چووە نێو دونیای رۆژنامەنووسییشەوەو ـ وەك بایەخدان بە زمانی سەردەم ـ بایەخێکی باشی بە دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامە داو قوتابیەکانی خستە ئەو مەیدانەوەو خۆی فێری نووسینی وتاری رۆژنامەیی دەکردن، پاشان هەر لەو قۆناغ و رۆژگارەی میسردا بیری لە کاری بە کۆمەڵ و بیری لە کاری سیاسی ئاشکرا کردەوە، دواجار ئەوەبوو لە ١٨٧٩دا حزبی نیشتمانیی پێکهێنا، ئەمەش دەبێت بە سەرەتایەکی گەورە و نوێ لە ژیانی حزبایەتیو سیاسی

میسردا و کاریگەری زۆریشی دەبێت لەسەر بڕیاری سیاسی تا دەشگاتە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی حکومەت، دواتریش کاریگەری لەسەر هەڵگیرسانی شۆڕش دەبێت دژ بە ئینگلیز، پاشانیش لە قۆناغی دوای خدێوی ئیسماعیل کە تۆفیق پاشای کوڕی لە جێی دادەنرێت ـ لەبەر ئەوەی یەکێکە لە دۆستە نزیکەکانی ئەفغانی ـ بارودۆخی گونجاوتری بۆ دێتە پێش، تا ئەو دەمەی لە میسر وەدەردەنرێت.

دواتر چ لە ئێران و چ لە ڕووسیا و پاشان دیسان گەڕانەوەی بۆ ئەستەنبوڵی پێتەختی دەوڵەتی عوسمانی، لەسەر بڕیاری سیاسیو ناوەندی سیاسی کاریگەری هەبووە، دواتر کە لە پاریس دەگیرسێتەوە، لەوێش قۆناغێکی نوێترو کاریگەرتر لە بڵاوکردنەوەی تێزەکانی دەستپێدەکات، لەوێوە لەگەڵ محەممەد عەبدە کۆمەڵی (العروة الوثقی) پێکدەهێنن، پاشان گۆڤارێکیش بەو ناوەوە دەردەکەن، کە کاریگەری لەسەر هەموو جیهانی ئیسلامی دەبێت، تەنانەت هەندێك زانا و ڕۆشنبیر لە ئەمریکا و فەرەنسا و بەریتانیا و رووسیاش ئاگاداری بیروبۆچوونو بزاڤەکەی بوون.

جا بە رای من: بوونو سازانی زەمینەی سیاسی و ڕۆشنبیری، ڕاستەوخۆ پێگەیاندنی قوتابیو پاشان بێجگە لەنووسین پشت بەستن بە ڕۆژنامەنووسی یو هەوڵی دەرکردنی ڕۆژنامە و پاشان گۆڤاری (العروة الوثقی) لە هۆیە دیارەکانی دەرکەوتنو بڵاوبوونەوەو سەرکەوتنی بۆچوونەکانی سەید بوون، بەڵام لای (خالڵ) ئەمانە بەو ئاستە نەسازان، زەمینەی سیاسی لەبار نەبوو، ڕێگەی پێگەیاندنی فەقێو قوتابیشی نەگرتەبەر (بەنموونە بوونو پێگەیاندنی قوتابی لە بزاڤەکەی شێخ سەعیدی نورسیدا کاریگەری زۆری

هەبوو لەسەر پاراستن‌و پەخشکردنی پەیامەکانی نوور، هەروەها لای پایەدار مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە رۆژگاری زێڕینی تەریقەتەکەیدا، بوونی مەلا و زانای چاوکراوە، یان لەمدواییانەدا، لای زانایانی شەهید مامۆستا ئەحمەدی موفتیزادەو کاك ناسری سوبحانی، قوتابی رۆڵی گەورە دەبینن).

شێخی خاڵ رێگەی کاری بەکۆمەڵیشی نەگرتەبەر (بەو جۆرەی کە کۆمەڵە ئیسلامییە هاوچەرخەکان بە پێویستیەکی ئایینی دەزانن)، راستە ئەو پەیوەندی شەخسیی بە رەمزەکانی کاری ئیسلامی کوردستانەوە هەبوو ـ وەك مامۆستایان مەلا عوسمان عەبدولعەزیزو شێخ عەبدولعەزیز پاڕەزانی‌و...ـ ئاگاداری کاروباری بزاڤی (برایانی موسڵمان) بووە و سوودیشی لە بۆچوونەکانی هەردوو شەهید شێخ حەسەن بەننا و سەیدقوتب، وەرگرتووە، تەنانەت شێخ صەووافیش ـ وەك کەسی یەکەمی بزاڤی برایان لە عێراقدا ـ کەبۆ گەیاندنی جموجوڵ‌و کاری بانگەواز هاتووەتە کوردستان، شێخی خاڵیشی بینیووە (وەك مەرحوم جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز لەوەڵامی نامەیەکمدا لە ٨:١٠:١٩٩١ بۆی نووسیبووم)، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا نەچووە ناو کارەکەوە.

بە رای من ئاسایی بووە وەك زانایەکی گەورە نەچێتە نێو کارێکەوە کە تەنیا کارێکی پەروەردەیی نهێنی‌و زۆر سنووردار بووە، دەبێ ئەوەش بڵێین ئاسانیش نەبووە بچێتە ناو کارێکی وەهاوە، چونکە ساڵی ١٩٣٢ کە ساڵی بیرکردنەوەو گۆڕانکاریی بووە لای ئەو، دەنگو ڕەنگی کاری حەرەکیی ئیسلامی لە کوردستاندا دەرنەکەوتبوو، نزیکەی ٢٠ ساڵ پاش ئەوە ئەو دەنگو رەنگە دەرکەوت، لە کاتێکدا کە شێخ رێگەی خۆی گرتبووە بەر و

تەمەنیشی لە هەڵکشاندا بووە، کارەکەش ـ وەك وتمان ـ زیاتر حەرەکی و نهێنی بووە، نەك بزاڤێکی ئاشکرای فیکریو زانستیو کۆمەڵایەتی بەرفراوان کە لەگەڵ سروشتی رۆشنگەرانەی خاڵدا بگونجێت، لەوە دەچێت زانیبێتیشی کە ئەو کارە بەو زووانە فریای شتێك لە گۆڕانکاریی ناکەوێتو ئەو زەمینەیەش لە ئارادا نییە، وەك ئەو بزاڤە سیاسیە ئامادەیی هەبێت کە ئەفغانی لە میسر جوڵاندیو پشتیوانی لێکرد.

لە ڕووی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییشەوە زەمینە بۆ خاڵ لەبار نەبوو، لەڕووی رۆشنبیرییەوە خەڵك ئاستی نزم بوو، ئەو جوڵە رۆشنبیرییە لە وڵاتێکی وەك میسردا هەبوو لە کوردستان نەبوو، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە کۆمەڵی ئێمە گیرۆدەی دۆگمایی و دیلی دابونەریتی هەڵە بوو، قەبوڵ کردنی بیری نوێ بە تایبەت لەبارەی ئایینەوە ئاسان نەبوو، نەك هەر لای خەڵکی ئاسایی، بەڵکو لای هەندێك لە کەسانی ناوەندە ئایینییەکەش، زەمینەی ئەوەیشی بۆ نەڕەخسا خۆی گۆڤارو رۆژنامە دەر بکات، یان سەرپەرشتی بکات.

بەکورتی ئەوەی بۆ ئەو گونجا خەتابەتی مزگەوت و قەزاوەتی دادگە و دانانی کتێب و نووسینی وتار بوو لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا، دیارە ئەمانەش بە تەنیا و لەو سنوورە تەسکەدا ـ بە تایبەت سنووری چاپو بڵاوکردنەوە ـ بەس نین بۆ ئەوەی دیدو هزری نوێو پرۆژەیەکی تەجدیدی ڕەنگ بگرێت، ئەگەر چی کارەکانی لەو رۆژگارو هەلومەرجەی کوردستاندا ـ وەك لە پێشەوە گوتمان ـ کاری گەورەو کاریگەر بوون، بە نموونە ئەو لە گۆڤارێکی وەك گەلاوێژدا هەم تەفسیرو هەم هەندێك لە بۆچوونەکانی دیکەی بڵاو

دەکاتەوە، لە کاتێکدا گەلاوێژگۆڤاریکی ئایینی نەبووە، بەڵکو گۆڤاری نەوەیەکی تازە رۆشنبیری خۆ بەعەلمانیزان بووە، مامۆستایەکی وەك برایم ئەحمەد رۆڵی سەرەکی لە بەڕێوەبردنیدا بینیوە، بەلاّم چونکە شێخ زانیوێتی کوردانە و هۆشیارانە موسڵمانەتی بکات خاوەنی پایەیەکی بەرزیش بووە، ئاسایی بووە بابەتە ئایینییەکانی لە گۆڤاریکی وەهادا بلاّوبکرێنەوە، ئەمە لە کاتێکدا دەشێ مەلای وا هەبووبێت خۆیندنەوەی گۆڤاری گەلاوێژی بە حەرام زانیبێ! یان لەم رۆژگارەدا گۆڤار و رۆژنامەی وا هەبێ خۆی بە پێشکەوتوو بزانێت، بەلاّم ڕێگە بە بلاّوکردنەوەی وتارێکی ئایینیی نەدا!.

بەڵێ، بێگومان ئەو لە زۆر کەناڵەوە هەوڵیدا، بەلاّم زۆرەکە هەر کەم بوو، گۆڤارو رۆژنامەی سەربەخۆ و هاوبیری هاوکاری راستەوخۆی نەبوو، زەمینەی گشتی نەسازابوو، تەنانەت تا ئێستاش بیرو بۆچوونی ئەو لای هەندێك لە خەڵکی ئایینداری رواڵەتبین نامۆو جێگەی گومانە!.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك لە نوێبوونەوەی گوتاری ئایینیدا کاریگەری هەبووە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: ئەگەر بە وردی لە تەفسیر و وتاری نێو گۆڤارو رۆژنامەکانیو کتێبەکانی دیکەی رامێنین، هەست بەو کاریگەرییەو بەو نوێکردنەوەیە دەکەین ، تەفسیرەکەی تەفسیرێکی پاكو پاڵفتەبوو لە خوارفەت و ڕاو بۆچوونی لاوازو ئیسرائیلیات، لەلایەکی ترەوە ڕوونتر تیشکی خستۆتە سەر پێشکەوتنو زانستخوازییو دادپەروەرییو گونجاوی ئەحکامەکانی قورئان بۆ هەموو سەردەمێك،کۆشاوە عەقیدەی خەڵك لە خڵتەی خورافەت، پاك بکاتەوەو خوای گەورە لە ئاوێنەی ئایاتی نووسراو کە

قورئانه و ئایاتی بینراو و له ژێر تیشكی خۆری ناوه جوانه‌كانیدا بناسرێت‌و بپه‌رسترێت.

پاش قورئان‌و ئیمان، له باره‌ی ژیاننامه‌ی پێغه‌مبه‌ره‌وه (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت)، بۆ ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی نه‌زانیی‌و خورافه‌ت‌و بۆ پوچه‌ڵكرنه‌وه‌ی هه‌ندێك كتێبی مه‌ولوودنامه‌ی پڕ له نه‌زانین، (مه‌ولوودنامه‌ی نه‌وئه‌سه‌ر)ی نووسی، ئه‌گه‌رچی له نامیله‌كه‌یه‌كی بچووكدا بووه‌و به ناوی مه‌ولوودنامه‌شه‌وه، به‌ڵام توانی مه‌به‌سته‌كه‌ی به‌دیبێنێت‌و بازاڕی مه‌ولوودنامه مردووه‌كان بشكێنێت، به‌وه‌ی كه ئه‌و له كتێبه‌كه‌یدا پوخته‌یه‌كی راست‌و دروست‌و واقعیی له باره‌ی ژیانی حه‌زره‌ته‌وه خستبووه روو، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ش، ناوی مه‌ولودنامه‌ی لێناوه بۆ بێ ره‌واجكردنی مه‌ولوودنامه‌كانی دیكه‌و بۆ ئه‌وه‌ی له ئاهه‌نگه‌كانی مه‌ولوودنامه‌شدا بخوێنرێته‌وه، كه ئه‌و ده‌م و تا ئێستاش له‌و جۆره ئاهه‌نگ و مه‌ولودنامه گێڕانه هه‌ر ماوه‌و ده‌توانم بڵێم له‌لای چینی نه‌خوێنده‌واری كورد ـ به‌داخه‌وه ـ هه‌تا ئه‌م دواییانه‌ش كه‌سێتی پێغه‌مبه‌ری ئیسلام (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت) له‌و مه‌ولوودنامانه‌وه ده‌ناسرا، كه زۆربه‌یان له هه‌ندێك باسی لاوه‌كیی به خورافه‌ت شێلراو زیاتر شتێكی دیكه نه‌بوون..، بێگومان ئه‌م كتێبه‌ی بۆ خه‌ڵكی گشتی بووه، ده‌نا له چه‌ند نووسینێكی دیكه‌دا به زمانی جیاواز و بۆ ئاستێكی باڵا، له‌سه‌ر په‌یامی پێغه‌مبه‌ری نووسیووه و به تایبه‌ت باسی ماف‌و ئازادییه‌كانی تێدا كردووه. (ناڵه‌ی ده‌روون ـ به‌رگی ٢ لا٣٨).

له وتارێكیدا به ناونیشانی (یادی له دایكبوونی پێغه‌مبه‌ر دروودی خوای له‌سه‌ر بێت) باس له جیهانێتی ئیسلام‌و یه‌كسانی مرۆڤه‌كان‌و ماف‌و بوونی

ئایینەکانی پێشوو لە ئایینی ئیسلامدا دەکات.. پاشان باس لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات کە پەیامی پێغەمبەر بونیاتی نا، کە کۆمەڵگەیەکی فرە ڕەنگو ڕەگەزو بێ چینایەتیە، دینو دونیا و دەسەڵاتی تەشریعیو تەنفیزی پێکەوە بەستووە..، هەروەها پێیوایە ئەو کۆمەڵگەیە بناغە بوو بۆ دیموکراتیەتو بۆ جاڕی مافەکانی مرۆڤ، شێخ لە کۆتایی وتارەکەیدا و لە باسی بەجیهانیبوونی ئیسلامدا دەزانێ بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە ئەم بۆچوونانەی تازەنو وەرگرتنیان ئاسان نییە، بۆیە دەڵێ :"ئەگونجێ هەندێك کەس ئەمڕۆ لەم قسەیەم سەر با بدات" بۆیە ئەم ئایەتە بە گوێیاندا دەدات : (ولتعلمن نبأه بعد حين..).

هەر لە وتارێکی دیکەدا بە ناونیشانی (پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت) باس لەوە دەکات کە ئەو هەر پێغەمبەری نوێژو ڕۆژوو نەبووە، بەڵکو پێغەمبەری بواری سیاسیو کۆمەڵایەتیو پەروەردەو پێگەیاندن بووە، لەو وتارەدا تیشك دەخاتە سەر هەموو ئەو بوارانە و لە کۆتاییشدا دەڵێت: "کەوابوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە یەککاتدا خواپەرستو گۆشەگیرو سیاسیو سەربازو فەرماندەرو دواندەرو پزیشكو زانا و پاشا بووە (بە مانای سەرکردەی وڵات)" دیارە دەرخستنی ئەم تێگەشتنە گشتگیرە لە ئایین پەیامێکە بە ڕووی سەرەتاکانی بیری جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان و لە دونیا. دەنا پێغەمبەرێتی پێناسەو پەیام و تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

وتارەکانیشی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا ـ کە کۆمەڵێك وتاری کۆمەڵایەتیو سیاسی بوون ـ پڕ بوون لە ئاماژەی نوێ، هەر خۆی گرتنەبەری ڕێگەی بڵاوکردنەوەو کاری بانگەواز لە گۆڤارو ڕۆژنامەدا کارێکی نوێ بوو، لە

کاتێکدا لای هەندێك بەناو مەلا، خوێندنەوەی گۆڤارو رۆژنامە جۆرە لادان و فاسقبوونێك بووە.

ئەگەر ئاماژە بە هەندێك لە وتارەکانی بکەین، دەردەکەوێت شێخ تا چ ئاستیك هەوڵی نوێکردنەوەو گۆڕانکاریی داوە، لە وتارێکیدا بە ناونیشانی (مافو سنوور) بە قوڵیی لەو چەمکە دواوە، باس لە ئازادیی مرۆڤ دەکات تا ئەو شوێنەی مافی خەڵکانی دی پێشێل نەکرێت و نەبێتە مایەی ئازار بۆ دەوروبەری، تەنانەت لە وتارەکەدا دژایەتی ئەو دیاردەیە دەکات کە جاران لە شاری سلێمانی پێش بانگی بەیانی لە بڵندگۆوە شیعر خوێنراوەتەوەو مەقام وتراوە، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی بێزارکردنی خەڵك، هەر لە وتارێکی دیکەدا بە ناونیشانی (بانگ) باس لە فەلسەفەی بانگ دەکات، کە بانگکردنی مرۆڤە بۆ لای خودا بۆ دروستکردنی کەشو هەوایەك کە ژیان تێیدا مانا جوانەکانی دەرکەوێ‌و مرۆڤەکان چەند ساتێك برایانەو بەبێ جیاوازی لە رووی مافو رێزەوە پێکەوە بنو گەورەکان بە بیستنی (الله اکبر) لە عەرشی پلە و پایەوە بێنە ریزی خەڵکەوە.

هەر لە ڕووی ماف و ئازادییەوە، باوەڕی تەواوی بە مافە سروشتی‌و خواکردەکانی ئافرەت هەبووە، لە روانگە قورئانەوە ئافرەتی بە تەواوکاری پیاو زانیوە، باوەڕی وابووە بە هەردووکیانەوە (مرۆڤ ) بوونی دەبێت، نەك بە یەك ڕەگەز ـ وەك لە وتاری (ژنهێنانو تەڵاقدان)دا ئاماژەی پێکردووە ـ هەروەها لە وتارێکدا بە ناونیشانی (دایك) بە درێژی باس لە گەورەیی‌و پیرۆزیی وەزیفەی دایکایەتی دەکات، لە پێناو پاراستنی خێزان و پاشان

پاراستنی کۆمەڵ لە ڕێگەی خێزانەوە، لە دادگەشدا زۆر لەو کێشانەی چارەسەر کردووە کە بەرەو تەڵاق و جیابوونەوە رۆیشتوون.

هەر لە چوارچێوەی نوێکردنەوەی گوتاری ئایینیدا، ئەو لە وتارێکدا بە ناونیشانی (دە ئامۆژگارییەکە)، دە ئامۆژگاری (کەسێکی ئەمریکایی) پێشچاو دەخات کە ئەمڕۆ ئەو جۆرە باسانە دەچنە بازنەی بابەتەکانی (گەشەپێدانی مرۆییەوە)، ئامۆژگارییەکان پلانی تاکەکەسین بۆ (خۆبەڕێوەبردن).

لەوتارێکی دیکەدا باس لە ڕۆڵ و پێگەی زانکۆ و مامۆستای زانکۆ دەکات، لە وتارێکی دیکەدا باس لە زانین، لە بابەتێکدا ئەو نەریتە نادروستە تێکدەشکێنێت کە لە کاتی مانگگیراندا باو بووە، ئاماژەش بە مانگ گیرانەکەی سەردەمی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات کە چۆن ڕێگەی نەدا بیری خورافیانە لای خەڵکی دەوروبەری دروست ببێت.

شێخ ئەوەندە قوڵ و فراوان لەگەڵ نوێکردنەوەدا بووە، نەك هەر لە ئاییندا، لە شیعریشدا نوێکردنەوەی زۆر بە پێویست زانیوە، لەکاتێکدا نەك هاو تەمەنانی ئەو، بەڵکو چەند ئەدیب و رەخنەگرێکی ناودارمان کە ئێستاش لە ژیاندان، هەر شیعری عەرووزی و قافیەدار بە شیعر دەزانن، کەچی شێخ لە وتارێکیدا بە ناونیشانی (شیعرو شاعیر) دەڵێت: "شیعر دەبێ هەمیشە لە گۆڕان و تازەبوونەوەدا بێ، بەپێی ڕۆژ کاڵا لەبەربکات، شاعیری ئەمڕۆ ئازا و سەربەستن، لە کەس ناترسن، شیعری ئەمڕۆ دیلی وەزنی خەلیل و عەرووزی ئەو نییە".

لە سەروو ئەم تێگەشتنە قوڵەیەوە لە ئیسلام و پەیامەکەی، ئەو کەسێکی بەئاگاش بووە لە پێشکەوتن و باری ڕۆشنبیری گەلان، بۆیە هەستی

بەوە کردبوو دەبێ زمان و گوتاری ڕۆژگارەکە بدۆزێتەوە، مرۆڤ ئەگەر نەیزانی لە چ سەردەمێکدا دەژی، نازانێ لەگەڵی بژیو دەنگی خۆی تێیدا بدۆزێتەوەو بانگەوازەکەی بگەیەنێت، ئایین بە گشتی جیاوازی سەردەمەکانی بە هەند گرتووە ـ وەك پێشتریش ئاماژمان پێکرد ـ ئایینەکان بە گشتی هەریەکەیان بۆ سەردەمو ڕۆژگارێكو جوگرافیایەك بوون، نەك یەك ئایین بۆ هەموو سەردەمیك، پەیامی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆیە بۆ هەموو سەردەمێکە، چونکە کۆکراوەی هەموو پەیامە ئاسمانییەکانە، پاشان ئیسلام هەڵگری پڕۆسەی نوێکردنەوەو ئیجتیهادیشە، شێخ بە تەواوی هەستی بەم ڕاستیانە کردبوو.

لە کۆتایی وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، شێخ نەك باوەڕی بە چاکسازیی و نوێکردنەوە، باوەڕی بە زەروورەتی گۆڕانکارییش هەبووە بۆ هەندێك لە کایەکانی ژیان، لە ڕوانگە ئایەتی "ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم" و ئایەتی "وان لیس للانسان الا ما سعی"وە مرۆڤی بە میحوەری ئەو گۆڕانکارییە زانیوە، وەك لە وتاری (هیوا) و وتاری (بیگۆڕن تا خواش بیگۆڕێ)دا ئەو باسەی کردووە.

ئەمانە هەندێك ئاماژە بوون بۆ بوونی جێگە پەنجەی ئەو لە نوێکردنەوەی گوتاری ئایینیدا، شێخ نوێکردنەوەی مەعالیمی ئیسلامیشی بە پێویست زانیوە ـ وەك لە نووسینەکەی خۆمدا ئاماژەم پێکردووە ـ بە هەوڵ و هیممەتی ئەو خانەقای مەولانا خالیدو چەند مزگەوتێکی دیکە ـ وەك ڕەمزی شارستانەتی ئیسلامی ـ دەستی تەعمیرو نوێکردنەوەیان پێدەگەیەنرێ.

**د. ئاراس: ئایا هەوڵی نوێکردنەوەی ئایینی زەروورەتێکی ئەو کاتو سەردەمە بووە، یان زیاتر لەژێر کاریگەری دەرەکیدا ئەو هەوڵانە دەرکەوتوون؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: هەم زەروورەت بووە، هەم لە ژێر کاریگەری بزاڤەکەی ئەفغانیو پێشکەوتنی ژیاندا بووە، خالێ هەم هەستی بە زەروورەتەکە کردووە، هەم لە بزاڤە نوێکەو لە جوڵەی گشتی ژیانیش بە ئاگا بووە، ئەگەر هەستی بەو زەروورەتە نەکردایەو لە بزاڤە تەجدیدیەکەش بە ئاگا نەبوایە هەنگاوی بۆ نەدەنا، ئەمانەش دوو خاڵی گەورەو گرنگن بۆ نوێکردنەوە.

بە گشتی بۆ جیهانی ئیسلامی بزاڤی نوێکردنەوە پێویست بووە، کاریگەری شەپۆلەکە کە جیهانی ئیسلامی گرتەوە، کوردستانیشی گرتەوە، هەروەها ـ وەك وتمان ـ نوێکردنەوە پێویستیەکی ئایینیشە، واتە کارەکەی مامۆستا خالێ لاساییکردنەوەی کوێرانە نەبوو، یان شوێن شەپۆل نەکەوتبوو، بەڵکو بە بوونی قەناعەتو بە جیددی و لێبڕانو خەمخۆرییەوە، چووە مەیدانەکە و لە سنووری توانا و گونجانیشدا کاری بۆ کرد.

**د. ئاراس: لە پێش ئەودا کەسی دیکە هەوڵی نوێبوونەوەو ئیسلاحی ئایینیی داوە لە کوردستان؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: بەڵێ، بە بێگومان، لە کوردستانی باکوور مامۆستا سەعیدی نوورسی (بدیع الزمان) بوو بە ڕێبەری بزاڤێکی نوێکردنەوە کە دوایی لە چوارچێوەی (پەیامەکانی نوور)دا بەرجەستە بوو، بزاڤێك کە پاشان بوو بە شۆڕشێك کە هەندێك لە توێژەران بە شۆڕشی

(رزگارکردنی ئیمان) ناوزەدی دەکەن، بزاڤێك کە تائێستاش لەگەشەکردنو پێشکەوتندایە و نهێنییەکانی لە دەرکەوتندان، ئەگەرچی بەداخەوە پەیامەکانی و بزاڤەکەی هێشتا لای کوردی ئێمە ـ وەك پێویست ـ نەناسراوە. (وەرگێڕانی پەیامەکانی بۆ زمانی کوردی لە لایەن مامۆستا فاروق ڕەسووڵ یەحیاوە، هەوڵێکی خەمخۆرانەیە لە پێناو ئەو ناساندنەدا).

هەروەها پایەدار، مەولانا خالیدی نەقشبەندی ـ وەك هەڵگری خەمێکی گەورەی ئایینی ـ دوای سەفەرکردنی بۆ هیندستان، بە پەیامێکەوە گەڕایەوە کە بزافێکی گەورەی خستە باری ئاییندارىو سیاسىو کۆمەڵایەتی کوردستانەوەو توانی ئەو بۆشاییەی کاری بە کۆمەڵی ئایینی پڕ بکاتەوە، لە پاش خۆیشی شێخی سیراجەددین بوو بە خەلیفە و بوژانەوەیەکی گەورەی زانستی لە هەورامانو دەوروبەرىو چەند ناوچەیەکی دیکەی کوردستان دەستپێکردو تیشکی عیلمو عیرفانی گەیشتە چەندین وڵات، کاریگەرییشی لەسەر بارودۆخی سیاسی و بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمانو شۆڕشەکانی هەبوو.

پاشان دەتوانین ناوی حاجی قادری کۆیی شاعیر بەرین کە بە باکگراوندێکی ئایینی ئاوێتە بە خەمێکی قوڵی دڵسۆزانەی کوردانە لە شیعرەکانیدا دژایەتیەکی راستەوخۆی خورافەتو دواکەوتوویىو ژێردەستەیی دەکرد کە چینێکی بە ناو ئاییندار کاریگەرییەکیان هەبوو لە دروستبوونی ئەو رەوشەدا.

مەلای گەورەی کۆیەش ـ کە مەلایەکی بلیمەتو خاوەن جورئەتو خەمخۆرێکی گەورەی ئاینو نەتەوەکەىو خاوەنی تەفسیری قورئانو توانای

ئیجتیهاد بووه ـ بە بێگومان یەکێك بووە لەوانەی کەوتووەتە ژێر کاریگەری بیری نوێکردنەوەی ئایینیو قوتابخانەکەی ئەفغانییەوە، من پێش شێخی خاڵ لە ١٩٩٢دا لەسەر ئەو زاتە هەڵکەوتووەم نووسی، پێش ڕاپەرین لەسەر ئەو دوو کتێب نووسرابوون، بەڵام بەداخەوە مەسەلەی نوێکردنەوەو کاریگەری ئەفغانیو قوتابخانەکەی لەسەر مەلای گەورەو سەرچاوەی بیرکردنەوەی ئەو لەو کتێبانەدا فەرامۆش کرابوو.

**د. ئاراس: ئایا بۆ کاتو سەردەمی خۆیان، خوێندنی حوجرە لە ئاستی پێویستدا بووە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: حوجرە لە رۆژگاری خۆیدا وەك تاکە ناوەندی خوێندنو فێرکردن لە کوردستاندا بێگومان بۆشاییەکی گەورەی پڕکردبووەوە، ئەگەر حوجرە نەبوایە لە خوێندنو خوێندەواری ئێمە چیمان دەبوو؟ بەڵام لەپاڵ ئەو خوێندنەشدا کەلتوری هەڵە بەرهەمهاتووە.

بە گشتی، خوێندنی حوجرە بەرزییو نزمیی بینیوە، وەستانو هەستانەوە رووی تێکردووە، لە قۆناغێکدا حوجرەکانی کوردستان ناوبانگی جیهانیی پەیدا دەکەن، لە سەردەمێکدا خوێندنگەکانی شارەزوور، لەسەردەمێکی دیکەدا قەرەداغ، سەردەمێکی دی خویندنگەکانی بیارەو تەویڵە و دەوروبەریان لە رۆژگاری بانگەوازی تەریقەتی نەقشبەندییدا، تەنانەت لە دەرەوەی کوردستانیشەوە ڕوویان تێدەکرێت، بە هۆی زیندوویەتی ئەو تەریقەتەوە.

حوجرە بەردەوام ناوبانگی هەبووەو کەسانی گەورەی پێگەیاندووە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو حوجرە و ئایین سەرچاوەی یەکەمی کۆی رۆشنبیری ئێمە

بووه، ئەو هەزاران دەستنووسە (هەر بە نموونە نامەخانەکەی خالْ (٦٣٦) دەستنووسی تێدا بووە) هەمووی بەرهەمی خامە و خەمخۆریی پیاوانی حوجرە بووە، بەڵکو حوجرە مایەی زیندوویەتی رۆحی نەتەوەی کوردیش بووە ـ وەك مامۆستای پارێزەرو زیندووکەرەوەی دەستنووس ـ محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵێت ـ ئەحمەدی خانی لە حوجرەوە داوای دەوڵەتی کوردی دەکاتو جاڕی سەربەخۆیی رادەهێڵێت (دیفاعیك لە حوجرەکانی کوردستان)... مامۆستا محەممەدی مەلا کەریمیش لە وتارێکی گۆڤاری (بەیان)دا (حەفتاکان) بە ناونیشانی (فەقێو فەقێیەتی لە کوردستانی جاراندا) دەڵێت: "حوجرە یەکێك بووە لە مەرجە پێکهێنەرەکانی بەنەتەوەبوونی کورد".

دەبێ ئەوەش بڵێین حوجرە خوێندەواری بێئاگا و تەقلیدییشی بەرهەمهێناوە، هەروەك چۆن لەم رۆژگارەشدا زانکۆ و خوێندنی نوێ خوێندەوار و خاوەن بڕوانامەی لەمجۆرەمان بۆ بەرهەم دەهێنێت، سەرچاوەی فیکرو رۆشنبیری ئێمە بەر لە ئیسلامیش، ئایینی بووە، حوجرەش نوێنەرایەتی ئایینو رۆشنبیریو خوێندەواری کردووە، بەڵام بە رای من هۆکاری سەرەکی پەراوێزکەوتنو بەجێمانی ئەو خوێندنە، نەگەیشتنی بوو بە قۆناغی بەزانکۆبوون (وەك زانکۆی ئەزهەر کە نەك هەر لە میسردا، لەسەر ئاستی جیهانیی ئیسلامییش کاریگەر بووەو تائێستاش ئەو کاریگەرییەی هەر ماوە).

**د. ئاراس: دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالیو مەولەویو مەحویو سالمو جزیریو چەندانی دیکە، بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: ژینگەی حوجرە کاریگەری راستەوخۆی هەبووە، لە حوجرەدا خوێندنی شیعر، نموونە شیعرییەکان لە وانەکاندا، پاشان شیعر وەك تاکە ژانری ئەدەبو نووسین، شەڕە شیعر، زیندووکردنەوەی بۆنە ئایینییەکان، ئەمانە دەرگا بوون بۆ چوونە نێو جیهانی شیعر، لەو سەردەمەدا زۆربەی خوێندەواران دەبوو سەروکاریان لەگەڵ شیعردا هەبێت، چونکە شیعر سەرەکییترین کەناڵی دەربڕین بووە - وەك لە نووسینی تریش باسم کردووە - شیعر لەو رۆژگارەدا دەزگای راگەیاندن و رۆژنامە و کەناڵی ئامۆژگاری و فێرکردن بووە، هەروەها حوجرە ئاوێنەی جیهانبینیی ئایینی بووە، جیهانبینییش زەمینەی شیعرەو بەبێ زەمینەی جیهانبینیی، شیعر بەرهەم نایەت، جیهانبینیی مەحویو مەولەوی بە نموونە جیهانبینییەکە حوجرە رۆڵی هەبووە لە ڕەنگڕشتنیدا، مامۆستا هێمن موکریانی لە پێشەکی دیوانەکەیدا (تاریكو روون) جوان ئاماژە بە کاریگەری خوێندنی حوجرە دەکات لە کرانەوەی قەریحەی شیعریدا، بەڵام ئەمانە بە تەنیا بەس نین بۆ بەشاعیربوون، ئەم کەشو هەوایە بۆ هەموو فەقێکان هەبووە، دەشێ زۆربەش شتێك لە شیعریان نووسیبێت، بەڵام دوایی لە نێو هەمووواندا ژمارەیەك شاعیر - بەمانای وشەکە - هەڵدەکەون، واتە هەمووان نابنە مەحوی و مەولەویو نالیو جزیریو بێخود، ئەمەش دیارە هۆکارەکە جیاوازی بەهرەو ئامادەیی زاتی و خۆپێگەیاندنو بوون بە خاوەنی

ئەزموون‌و بە پلەی بالآش عاشقبوونە، شیعر بەبێ عیشق‌و ئەزموونی روحیی‌و بیرکردنەوەی قولێ بۆ مرۆڤدۆستیی‌و جوانییناسین بەرهەم نایەت، بەڵێ پێکهاتەی ئەندێشەی ئەوان بە پلەی یەکەم بۆ کەشوهەوای حوجرەو خوێندنی ئایینیی دەگەڕێتەوە، دەتوانم بڵێم شاعیرانی سەردەمی نوێش، واتە قۆناغی گۆران‌و شێخ نووری‌و بێکەس‌و بەدواشیاندا هێمن‌و هەژارو دیلان‌و کامەران‌و هی دیکەش، قەرزاری کەش‌و هەوای خوێندنی حوجرەن، هەر لەم ڕووەوە نووسەری گەورەو ناسراو محەممەدی مەلا کەریم لە هەمان وتاردا کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، دەڵێت: "فەقێ و مەلا دەورێکی گەورەیان لە پاراستنی زمانی نەتەوەییماندا بووەو لە حوجرەوە نووسینی شیعر و پەخشانی کوردی دەستی پێکردووەو تێکڕای ئەدەبی کلاسیکمان بەرهەمی مزگەوت و حوجرەیە".

ئیدی من ناچمە ناو باسی کاریگەری گوتاری ئایینی لەسەر تەواوی ئەدەبی کوردی، بەڵکو ئەدەبی هەموو نەتەوەیەکیش.

**د. ئاراس: حاجی قادری کۆیی‌و مەلای گەورەی کۆیە ئەو دونیابینیی‌و نوێخوازییەی هەیانە بەرهەمی حوجرەیە، یان بەهۆی کاریگەربوونیانەوەیە بە بزافی رۆشنبیری ئەوروپا؟ یان کاریگەری بیری قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەیە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: حاجی قادری کۆیی ئەوکاتەی لە ئەستەمبوولێ بووە کەوتووەتە ژێر کاریگەری پێشکەوتنی ئەوروپاوەو ئاگاداری ئەو پێشکەوتنە بووە، بەڵام گومانی تێدا نییە لە ڕووی ئاییندارییشەوە لەوێ زیاتر چاوی کراوەتەوە، مەلای گەورەش هەم بە پێشکەوتنی ئەوروپا کاریگەر بووە،

هەم بە بیری قوتابخانەی ئیسلاّحیی جەمالەددینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە، بەلاّم دەبێ ئەوەش بزانین، ئەوان ئەوەندە هۆشیار بوون لەوە تێگەیشتوون کە ئیسلام کێشەی لەگەڵ پێشکەوتنی دونیادا نییەو لەگەڵ زانستو جەوهەرو سروشتی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا ناتەبا نییە، هەروەها ئەوان لەوە بەئاگابوون کە رۆژگارێك هەبووە ئەوروپا لە ژێر کاریگەری زانستو پێشکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامیدا بووە، یەکێکیش لە جیاوازییەکانی کەسانی وەك مەلای گەورەو شێخی خالّ لەگەڵ زاناو مەلای دیکەدا ئەوە بووە کە ئەوان دەرگاو پەنجەرەیان لە رووی بیری مرۆڤ و پێشکەوتنەکانیدا دانەخستووە، وەك هەندێکی دی کە سەرلەبەری زانستو پێشکەوتنی ئەوروپایان بەلاوە هەڵە بووەو بە بەرهەمی بێباوەڕیی‌و داگیرکارانیان زانیوە.

پاشان، وەك وتمان، کاری سەرەکی بزاڤی تەجدیدیی بەبێ بەئاگابوون لە پێشکەوتن و گەشەکردنی زانست وفیکر هەرگیز زەمینەی بۆ ناسازێ، پێشکەوتنی ژیان وا دەکات کە ئایین نوێکردنەوە بە پێویست بزانێت، جا قوتابخانەی ئەفغانییش ئەرکی بەرهەمهێنانی گوتارێك بووە بۆ ئەو سەردەمە نوێیە و گۆڕانکارییەکانی، بۆیە ئاساییە ئەوان وەك خوێندەواری حوجرە لەگەڵ بەشێکی زۆر لە دەسکەوتەکانی مۆدێرنە و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا تەبا بووبن، بەلاّم ئەمە بەو مانایە نا کە ئەوان ـ بە تایبەت حاجی قادر ـ بیرکردنەوەیان بازنەی ئایینی جێهێشتبێ ـ وەك هەندێك نووسەر بەو ئاڕاستەیە خوێندنەوەیان بۆ کردووە!ـ لەم رووەوە شیعرەکانی باشترین بەڵگەن.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢دا دانەیەکی گۆڤاری (العروه الوپقی)م دەستکەوت‌و خوێندمەوە، پەردە لەسەر چاو و دڵم لاچوو، لە بارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە" ئایا پڕۆگرامی حوجرە ئەوەندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: گۆڤارەکە لە خودی گۆڤاربوونیدا نەبوو، بەڵکو لەوەدا بوو کە پڕۆژە بوو، خوێندنی حوجرە بیری مرۆڤ دەکاتەوە، بەڵام کام حوجرەو کام مامۆستا؟ حوجرە بە تەنیا بەس نییە بۆ کرانەوەی بیر، یان شتێك نییە بیری مرۆڤ بکاتەوە ئەگەر کەسەکانی بیرکراوە نەبن، پاشان گۆڤار و رۆژنامە ئاوێنەی کۆمەڵ‌و دەنگی خەڵك‌و دەرەوەی حوجرەیە، بۆیە بەئاگابوون لە دەرەوەی حوجرە کە جاروبار بوونێکی داخراو و دابڕاوی هەبووە، گۆڤارو رۆژنامە پرد بووە، خوێندنی حوجرە هەموو شتێك نییە، حوجرە ئەرك‌و وەزیفەی خوێندن‌و زانستی هەیە، دەتوانم بڵێم نەك حوجرە، خوێندنی ئەمڕۆش تەنانەت لە ئاستی زانکۆو خوێندنی باڵاشدا بە بێ خوێندنەوەی دیکەو بەبێ ئاگادار بوون لە گۆڤارو رۆژنامە، خوێندەواریی کلێشەیی، داخراو بەرهەمدەهێنێت، دەرچووانی زانکۆو خوێندنی باڵامان کەم نین کە لە دونیا و دەوروبەریان بیئاگان، وەك چۆن چەندین ئەکادیمیی بێ فیکرمان هەن، لەولاشەوە چەندین نائەکادیمی خاوەن فیکر هەن، بۆ خوێندنی حوجرەش بە هەمان شێوە.

شێخ لە خۆیدا ئامادەیی ئەوەی تیا بووە، مامۆستاکانی زانستی حوجرەشی مامۆستای گەورە بوون، بە ئاگاش بووە لە زاستی دیکە و

پێشکەوتن و گۆڕانی نویٚ، کە لە سەرچاوەی ئایینی، یان لای ڕەمزی ئایینی، بیرکردنەوەی تازەو گونجاوی لەگەڵ زانستدا بینیوە، سەرسام بووە، خوێندنی حوجرە لە هەندێك قۆناغیدا ئەوەندەی کە زانستی بەخشیوە، فیکری بەرهەم نەهێناوە، گۆڤاری (العروة الوثقى) گۆڤاری فیکر و شۆڕش و گۆڕانکاریی بووە، بانگەواز بووە بۆ پێشکەوتن و ڕزگار بوون و نوێکردنەوە.

ڕۆژنامەو گۆڤار ڕەمزی پێشکەوتن بووە، حاجی قادر دەڵیٚ:

**سەد قائیمە و قەسیدە کەس نایکڕیٚ بە پولیٚ**

**ڕۆژنامە و جەریدە کەوتۆتە قیمەتو شان**

شێخ خۆیشی لە وتارێکدا بە ناونیشانی (کەڵکی گۆڤار و ڕۆژنامە) لە ٢٠ خاڵدا زەروورەتی گۆڤارو ڕۆژنامە دەردەخات و لە کۆتاییشدا ڕای وایە "هیچ گەلێك بە بیٚ گۆڤارو ڕۆژنامەی باش بە ئامانج و مەبەستی خۆی ناگات"!.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ دەڵێت: "لە ژێر کاریگەری نووسین و بۆچوونەکانی ئەفغانییدا کەوتمە بیری دانانی فەرهەنگ و گرنگییدان بە زمانی کوردی"، بۆچی خوێندن و ژینگەی حوجرە لەوبارەوە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: بێگومان ئەو خوێندنە کاریگەری هەبووە، لەسەرەتاوە بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و زمانەوانیی ئێمە، بەڵکو سەرەتاکانی فیکرو بیرکردنەوەو تەنانەت شۆڕشکردنیشمان بەرهەمی حوجرە بوون ـ وەك لە پێشەوەش ئاماژەمان پێکرد ـ بەڵام حوجرە جاروبار، بە تایبەت لەم دواییانەدا، کەنارگیر بووە، ئەم وەزیفەیەی جێهیشتووە، لە سەردەمانێکدا لە حوجرەدا تەنیا خوێندنە زاستە شەرعییەکە وەرگیراوە،

دواتر کە رۆژگاری قوتابخانە و خوێندنی نوێ دێتە پێشەوە، دەرچووانی ئەم خوێندنە روو لەو ئەرکە دەکەن.

جیاوازی خالێ لەگەڵ هەندێك زانای ئایینی دیکەدا ئەوەبوو: ئەوەی زاناو نووسەرانی موسڵمانی عەرەب زمان ـ وەك ئەفغانی و عەبدە بەنموونەـ لە خزمەتکردنی ئیسلامو فەرهەنگی عەرەبیدا بۆ نەتەوەکەی خۆیانیان ڕەوا دیتووە، شێخی خالێ هات ئەو هەستو نەستە موسڵمانانەیەی خستە خزمەتی زمانو فەرهەنگی نەتەوەکەی خۆیەوە! ئەو ئاوها هۆشیارانە لە خزمەتکردنی ئیسلام و نەتەوەو فەرهەنگ تێگەیشتبوو، بەڵام هەندێکی دیکە لە زانایانی ئایینی کوردستان ـ وەك زانا عەرەبەکان ـ ئەڵبەت بە هەستێکی ئیسلامیانەی گشتیەوە ـ بەرهەمیان بۆ خزمەتی زمان و فەرهەنگی عەرەب بووە!

بەڵێ، لەم ڕووەوە ئەفغانیو ئەحمەد ئەمینو زانایانی دیکەی میسر لەسەر (خالێ) کاریگەر بوون، بەڵام بیرمان نەچێت، شێخی خالێ، ئەگەر لە سایەی حوجرەدا نەبوایە بەئاسانی بە قوتابخانەی ئەفغانی ئاشنا نەدەبوو، نابێ ئەوەشمان بیر بچێت رەگی رۆشنبیریی خودی ئەفغانییش بۆ حوجرە دەگەڕێتەوە.

**د. ئاراس: بۆچی هەریەك لە مەلای گەورەی کۆیە و شێخی خالێ نەیانتوانی لە رۆژگاری خۆیاندا وەك نویخوازێکی ئایینی دەربکەون؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: ئەوان وەك کەسی ئالاهەڵگری نوێکردنەوەو چاکسازییو گۆڕانکاریی و کەسانی جیاواز لە رەمزی دیکەی ئایینی دەرکەوتنو بانگەوازی خۆیشیان کرد، بەڵام کە بانگەوازەکەیان ئەو کاتە

ڕەنگی نەگرت، هۆکاری زۆر بوو، زەمینە و ژینگەی کوردستانی باشوور هەر هێندەی لەباردا بوو، دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستان ئەو دەسەڵاتەی سەردەمی ئەفغانیی نەبوو، هۆکاری بڵاوکردنەوەش کەم بوو، چاپەمەنیو گۆڤارو رۆژنامە لە هەنگاوی سەرەتاییدا بوون، تەفسیرەکەی مەلای گەورە لەم دواییانەدا چاپکرا، زۆر لە نووسینەکانی دیکەی هێشتا ڕۆشنایی چاپیان نەبینیوە، مەلا و فەقێ و ناوەندی ئایینی باو ـ کە مەلای گەورە زۆریش لەگەڵیاندا خۆی ڕەتاند ـ نەهاتنە سەر ڕێگەی گۆڕانکاریی و چاکسازیی، دەتوانم بڵێم بۆ سەردەمی مەلای گەورە تەرزی ئاییندارییە باوەکە و رەمزەکانی، ئاستەنگێکی زۆر گەورەی بەردەمی مەلای گەورە بوون، ئەگەر سەیری شیعری مەلای گەورە بکەین زیاتر رووی لەوانە، ئەڵبەت هۆکاری دروستبوونی ئەو کەشو هەوا نادروستەشی ڕوونکردووەتەوە، دەنا مەلای گەورە چ لە زیرەکیی و هۆشیاری و ئاستی زانستییدا، چ لە بوێری وجەسارەتیدا، چ لە فێرکردنی قوتابی و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵدا، چ لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتیو سیاسییدا شتێکی وەهای لە جەمالەددینی ئەفغانی کەمتر نەبووە، بەڵام ژینگەی ئەم کوردستان بوو، کوردستانێکی داگیرکراو بە مانای وشەکە، نەك هەر خاکی، بەڵکو عەقڵو بیری خەڵکەکەشی داگیر کرابوو، ئەوەی کە دەبوو ببێتە هۆی ئازادی، کە ئاییندارییی بوو، خۆی کرابووە زیندانی عەقڵو بیرکردنەوە، بە تایبەت بە ناوی تەریقەتو تەسەوفەوە (ئەڵبەت کە دەگوترێ مەلای گەورە و شێخی خاڵ زۆر دژایەتی دەروێشایەتییو سۆفێتییان کردووە، بەو مانایە نەبووە کە ئەوان دژی تەریقەت و تەسەوف بووبن، بەڵکو دژی ئەو خورافەتانە بوون کە بەو ناوەوە

برەویان پێدراوە، دەنا مەلای گەورە بە چاوی گەورەیی‌و ڕێزەوە لە ڕەمزەکانی تەریقەتی ڕوانیوە، وەك کاك ئەحمەدی شێخ و مەولانا خالید و شێخانی دیکەی نەقشبەندی، لە تەفسیرەکەشیدا ئاماژەی بەنموونەی کاری جوانی شێخان عاریفان کردووە، شێخی خاڵیش خۆی لە بنەماڵەوە خوێندەوار و پەروەردەکراوی دەستی تەریقەت بوون‌و لە هەموو کەس باشتر زانیویەتی مەولانا خالید کێ بووەو بە تەمای چی بووە؟).

لە ڕووی نالەباریی زەمینە و بارودۆخی سیاسییەوەو جیاوازی بارودۆخی کوردستانی باشوور لە شوێنی دی، سەیر دەکەین هەر کوردێکی وەك مامۆستا سەعیدی نورسی - بەڵام لە باکووری کوردستاندا - بە پایەی موجەدید دەگات و لە ئاکامیشدا پەیامەکانی، نەك وڵاتەکەی، بەڵکو سنووری ڕۆژهەڵاتیش دەبڕن، ڕاستە کورد لەوێش - بە تایبەت لە سەردەمی ئەتاتورکدا - ژێر دەستە بووە، بەڵام هۆیەکە ئەوەیە تورکیا پێشتر وڵاتی دوا قۆناغی خەلافەت بووە و خۆی بە میراتگری ئەو خەلافەتە زانیوەو لە ڕووی زانستیی‌و ڕۆشنبیرییشەوە وڵاتێکی زیندوو بووە، وێڕای ئەوەش، نورسی بە بەرنامەیەکی زانستییانە و لە ڕێگەیەکی پڕ لە ڕۆشنایی پرشنگی ڕوحیشەوە، زانستگەیەکی بۆ قوتابیانی پەیامەکانی نوور بونیات نا.

**د. ئاراس: بۆچی پرۆسەی پەروەردەو زانستی ئایینی لە کوردستاندا نەیتوانیوە خۆی نوێ بکاتەوەو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا هەنگاو هەڵگرێ؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: ڕاستە ئەم خوێندنە لە هەموو شوێنەکانی کوردستاندا وەك یەك بووە لە ڕووی وانە و شێوازی وتنەوەیەوە، بەردەوام

هەولێکیش هەبووە بۆ پاراستنی، بەڵام دەزگایەکی گشتیی پەروەردەیی لە پشت ئەو خوێندنەوە نەبووە، واتە لە سەرووی حوجرەوە دەزگایەك نەبووە بۆ دارِشتنی ستراتیژ و ئامانجو هۆکاری خوێندنو رێکخستنی کاروباری مامۆستاکانو پێگەیاندنی پسپۆڕ، لە سەرووی حوجرەوە جاروبار خانەقا و خێرەومەندان هەبوون بۆ پشتیوانی لێکردنی، لە هەندێك سەردەمدا میر و سەردارەکان، یان بەگو ئاغا و کوێخا یارمەتیدەر بوون!!.

بۆیە دەڵێین، ئەو نوێکردنەوەو خۆگونجاندنە پێوستی بە دەزگا و کار بۆ کردن هەبووە، پاشان لای هەندێك لە مامۆستاکان جۆریك لە بێئاگایی هەبووە لە گۆڕانکاریی و پێشکەوتن، یان جۆریك لە ترسو نیگەرانی هەبووە لە تێکەڵ بوون بە دەرەوەی حوجرە و خوێندەواری دی.

**د. ئاراس: بۆچی لەگەڵ هاتنی سیستمی نوێی خوێندنو قوتابخانەدا، خوێندنی حوجرە پاشەکشەی کرد؟**

مامۆستا نەبەز هەورامی: بێگومان خوێندنی حوجرە شتێکی گشتی نەبووەو بۆ هەموو کەس نەبووە، هەموو کەس نەیتوانیوە لە حوجرە بخوێنێت، یان لە توانای حوجرەدا نەبووە هەمووکەس لەخۆبگرێت، بەڵام خوێندنی نوێی دەوڵەتیی، گشتیی بووەو پێداویستی خوێندنیشی دابینکردووە، هەردەبوو خوێندن لە بازنەی بچووکی حوجرەوە بگوێزرێتەوە بۆ خوێندنی قوتابخانەی دەوڵەتی، لایەنێکی دیکەی ئەمە پێوەندی بە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە هەبووە، ژیانو گوزەرانی فەقێی ئەو سەردەمە لەگەڵ رۆژگاری نوێدا ناگونجێ، (راتبە و دەقنە) و نەریتەکانی دیکەی ئەو ژیانە لەگەڵ ژیانی ئێستادا پێکنایەتەوە، ئێستاش ئەگەر لە هەندێك شوێنی

کوردستان خوێندنی حوجرەو مەلایەتی مابێت لە رووی بەڕێوەبردنەوە وەك جاران نییەو لە هەندێك شوێندا کەمێك پێشکەوتووە، بژێوی فەقێ بە جۆرێکی دی لەلایەن خێرەومەندانەوە دابین دەکرێت، پاشان کات بەسەربردنی فەقێی ئێستا وەك جاران نییە، ئێستە فەقێش لە زۆر شوێنی کوردستان هەم بۆ خۆپێگەیاندنو هەم بۆ کات بەڕێکردن سوود لە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت دەبینێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین بڵێین لەو رۆژگارەدا لەسەر ئەو پرۆگرامە نەریتیە دێرینە، مەلا و زانای وەها هەڵکەوتوون لەم رۆژگارە پێشکەوتووەشدا ئاسان نییە هەڵکەوتنەوەیان، لەم رۆژگارەشدا لە خوێندنە نوێکەی کۆلێژەکانی شەریعەشدا بە دەگمەن موستەفا زەڵمیەكو عەلی قەرەداغییەك هەڵدەکەون، ئەگەرچی ئەوانیش سەرەتا کوڕی حوجرە بوون.

پاشان بەداخەوە، هەست ناکەم لە هیچ سەردەمێکدا دەسەڵاتو حکومەت پشتیوانی خوێندنی حوجرەی کردبێتو خستبێتیە بەرنامەی خۆیەوە (ئەگەر دژایەتی نەکردبێت) دەشزانین بەعس چەند ستەمکارانە کینەی خۆی بەسەر میحراب و مزگەوتو مەلا و حوجرەدا هەڵڕشت، لەم دواییانەدا لە کوردستان کۆلیژی شەریعەو پەیمانگە کرانەوە، هەر لەم نزیکانەش بوو وەزارەتی ئەوقاف خوێندنی حوجرەی خستە ژێر سەرپەرشتی خۆیەوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین، خوێندنی نوێ پرۆسەیەك نەبووە لەگەڵ رۆحی ئیسلامو ئاییناریدا نەگونجێ، زۆر لە مەلاکان رێگرییان لێنەکردووە، بەڵکو هاندەریش بوون، کەسێکی وەك مەلای گەورەی کۆیە پارچە زەوی خۆی

پێشکەش بە بینای قوتابخانە دەکات، نەك کوڕ، کچیشی دەنێرێتە قوتابخانە، هەروەها شێخی خاڵو ئەمڕۆش وەك دەبینین مامۆستاو رەمزە ئایینییەکان هەمان مامەڵەیەیان هەیە، راستە لەسەرەتاوە لەنێو مامۆستایانی ئایینیدا دژایەتی ئەو خوێندنە کراوە، بەڵام بەشێك لە هۆکاری دژایەتییکردنەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو خوێندنە لە رۆژگاری دەسەڵاتی داگیرکەراندا هاتۆتە کوردستانو وەها تێگەشتوون ئەوە بۆ دژایەتی گەلو ئایینی موسڵمانانە.. وەك مەرحوم مامۆستا مەلا محەممەدی مەلا ساڵحی شارەزووری لە دەستنووسی (ئیسلامو شارستانەتی مادییەتدا) ئاماژەی پێکردووە.

وەك لە پێشەوەش ئاماژەمان پێکرد، نەبوونی ئەو خوێندنە بە خوێندنی زانکۆیی، بەڵام لەسەر هەندێك لە بنەماکانی خۆی، هۆکاری دیاری ئەو پاشەکشێو بە جێمانەیە، ڕاستە ئێستە پەیمانگەو کۆلێژ بۆ شەریعەت هەن، بەڵام لە ئاستی پێویستدا نینو بەشێکن لە سیستمە پەروەردەییە بێسەروبەرەکە، بەڵکو بۆ ئەو بوارە قوڕەکە خەستترە !.

## دیمانەی دەیەم

# دیداری بەڕێز دكتۆر سەباح بەرزنجی

بەڕێز دكتۆر سەباح محەممەد بەرزنجی وەك رۆشنبیرو ئەكادیمیەكی نێو كایەی زانستو رۆشنبیری ئیسلامیو ئاگادار لە بزاڤی زانستیو رووناكبیری ئایینی لە كوردستاندا، لەهەمانكاتدا بەڕێزیان لەو بوارەدا خوێندنەوەی وردو زانستیی هەیە بۆ ئەو ئاڵوگۆڕانەی كە لە سەدەی رابردوو و ئێستادا لەو بوارەدا دەگوزەرێن، لەهەمانكاتدا نووسەر لە بنەماڵەیەكی ئایینیو زانستییەو ئاگاداری خوێندنو پەروەردەی مزگەوتو حوجرەو لایەنە باشو لاوازەكانی ئەو پرۆسە دوورو درێژەیە.

ئەوەندەی ئێمە بزانین بەڕێزیان ئاگادارو خوێنەری هەوڵو بۆچوونە ئیسلاحیيو نوێخوازەكانی شێخ محەممەدی خاڵە، ئێمەش بۆ شرۆڤەكردنی پرۆسەی خوێندنی مزگەوتو ئاگادار بوون لەو تێزو هەوڵە نوێخوازانەی لەلایەن پێشڕەوانی ئەو بیرەو مامۆستای خاڵەوە، دراون، هەروەها ئاستەنگو بەربەستەكانی بەردەم پرۆژە نوێگەریو ئیسلاحییەكەی خاڵو هاوڕێبازەكانی، ئەم دیدارەمان لەگەڵ بەڕێزیان سازدا:

١:٩:٢٠١١

سلێمانی

**د. ئاراس: جەنابی دکتۆر بۆ کاتو سەردەمی خۆیان خوێندنی حوجرەکان لە ئاستی پێویستدا بوون؟**

د. سەباح بەرزنجی: بۆ راڤەرکردنی ئەم پرسیارە پێویستە جیاوازیی بکەین لە نێوان قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی زانستی ئیسلامیو ئەو گۆڕانکارییە زۆرو زەبەندانەی بەسەر پرۆگرامەکانی خوێندندا هاتوون، لەهەمانکاتدا دۆخی کاتو شوێنی حوجرەکانی کوردستان لەبەر چاو بگرین، چونکە وەرگرتنی وەڵامێکی گشتی خزمەت بە پرسەکە ناکاتو حەقیقەت لە نێوان دار وپەردووی رۆژگار و تەپو تۆزی ئەو کارەساتانەی بەسەر کوردستاندا تێپەڕیون، ون دەبێت.

من پێموایە لەو سەردەمانەدا کە کۆمەڵگای کوردەواریو میرە کوردەکان بە حوکمی دینداریی، یان وەرگرتنی شەرعییەت، رەواجیان بە مزگەوتو حوجرەو فەرهەنگی کتێب داوە، واتە دەرفەتیان بۆ فەقێیان رەخساندووە زۆرتر بخوێننو زیاتر بمێننەوە، حوجرەکانی کوردستان زانای گەورەو شارەزایان پێگەیاندووە کە هەر کامیان بگریت حەکیمی حاڵی خۆیو دەور و زەمانەکەی بووە، بە پێچەوانەشەوە، لە قۆناغەکانی شکستو پشێویی شڵەژانی سیاسییدا حوجرەکان بەو شێوەیە نەبوونو هەڵکەوتووانی بواری زانستو فەرهەنگی ئیسلامی کەمو دەگمەنو نایاب بوون.

**د. ئاراس: بە رای بەڕێزتان خوێندنی فەلسەفە رەنگدانەوەی هەبووە لەسەر مەلاکانی کوردستان؟**

د. سەباح بەرزنجی: بێگومان خوێندنی مەنتیقو فەلسەفە کاریگەریی ئیجابیو سەلبـــی هەبووە، لە روویەکەوە ئیجابی بووە کە بووەتە هۆی

قووڵبوونەوەو وردەکاریی لە تێکڕای زانستەکان، بە حوکمی ئەوەی فەلسەفەو مەنتیق بۆخۆیان زانستی کردنەوەی عەقڵو وەڵامدەرەوەی پرسیارە بنەڕەتییو ئەبستیمۆلۆژییەکانی مرۆڤن، هیچ زانستێکی ئیسلامییش نییە بە مەنهەجی عەقڵیو مەنتیقیو فەلسەفی متوربە نەکرابێت، بەڵام لەو رووەوە سەلبی بووە کە ئەو هەموو یاسا و رێسا عەقڵییانە زۆر جار وەك تەرەفو چەرەسێکی رۆژانە مامەڵەی لە گەڵ کراوەو وەك پێویست بەکارنەهێنراوە بۆ بوارەکانی فیقهو تەشریعو زانستەکانی قورئانو حەدیس، واتە هەموو ئەو زانستانەی لە بنەڕەتدا دەبێت بڕۆنە خزمەتی مەنزوومە ئیسلامییەکەوە بۆ خۆیان بوونە ئامانجو غیابێکی تەواوی مەنهەجی قورئانو سوننەت باڵی کێشا بەسەر حوجرەکاندا لە سەردەمە دواییەکاندا.

فەلسەفەو مەنتیق لە باتی ئەوەی ببنە دینەمۆی ئیجتیهاد و خوێندنەوەی نوێ بۆ شەریعەت، بۆخۆیان بوونە بەربەستو رێگری هەر جۆرە نوێخوازییەك، واتە رێك بە پێچەوانەی ئەو ئامانجەی سەرەتا بۆ خوێندنی حیکمەتو فەلسەفە لەلایەن بیرمەندانی گەورەی ژیاری ئیسلامییەوە، رەچاو کرابوو.

**د. ئاراس: ئایا دەرکەوتنی شاعیرانی گەورەی وەك نالیو مەولەوی مەحویو سالمو چەندانی دیکە بەرهەمی حوجرەیە، یان هۆکاری دیکە لە پشت دروستبوونیانەوەیە؟**

د. سەباح بەرزنجی: هیچ گومان لەوەدانییە ئەو شاعیرە گەورانە بەرهەمی حوجرە و دەست نەمامی کەڵە زانایانی وەك شیخ عەبدوڵڵای خەرپانیو شێخ مارف نۆدێو ئیبنوئادەمن. لەهەمانکاتدا بۆ خۆیشیان هەوڵو هیممەتی

زۆریان داوە بۆ شارەزابوون لە کەلتوورو کەلەپووری عیرفان بە زمانی عەرەبیو فارسی، بە بێئەوەی پشتیوانییو پشتگیریی میرەکانی بابانو ئەردەڵانو شێخانی تەریقەتی نەقشبەندییو قادرییمان لە بیر بچێت کە پێکەوە کەشوهەوایەکی لەباریان بۆ پێگەیاندنی ئەدیبو زانای خوێندەوارو خاوەن دەفتەر و دیوان، خوڵقاندووە.

**د. ئاراس: خوێندنەوەی بەڕێزتان چۆنە بۆ تێزو نووسینەکانی شێخی خاڵ؟**

د. سەباح بەرزنجی: شێخی خاڵ لە چەند قۆڵەوە خزمەتی بە کەلتوورو بزاڤی کوردیو ئیسلامی کردووە:

لە رووی زانستییەوە کۆمەڵێك بەرهەمی زانستیی پێشکەشکردووە، دیارترینیان تەفسیری خاڵە، کە لە مێژووی بیری نوێخوازی ئیسلامییدا حسابی پێشەنگی بۆ دەکرێت.

لە رووی ئەدەبییەوە پەندی پێشینانو فەرهەنگەکەی خزمەتێکی گەورەن بە زمانو کەلەپووری کوردی، لە هەمان قۆڵەوە کۆمەڵە وتارێکی کۆمەڵایەتی بەنرخیشی لە دووتوێی (ناڵەی دەروون)دا بڵاوکردووەتەوە کە بە خوێندنەوەی من شێخی خاڵ لە بواری وتار (مقالة) نووسییشدا هەر پێشەنگە.

ئەتوانین لە روانگە کارەکانییەوە تێزی شێخ لە چەند خاڵێکدا کورت بکەینەوە:

١ـ گرنگییدان بە زمانو فەرهەنگی نەتەوەی کورد، هەنگاوی یەکەمی بووژاندنەوەی نەتەوەیی کوردە.

٢ـ گرنگییدان بە بەرهەمی ئەدەبی و عیرفانیی زانایان و ئەدیبانی رابردوو هەنگاوێکی کاریگەرە بۆ پێکهێنانی شناسی نەتەوەیی.

٣ـ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەو پەیامە ڕووحانیی و بڕواییە بەرزەیە کە دەتوانێت رەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی کوردستان بەرەو ئاڕاستەیەکی ڕێكو ئاسۆیەکی ڕووناك ببات.

٤ـ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لە هەموو کاتو ساتێکدا دەتوانێت وەڵامدەرەوەی ویستەکانی مرۆڤ بێت بە مەرجێك وەك ئایین‌و شەرعێکی تەعلیمیو لەسەر بنەمای ئیجتیهاد مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

٥ـ لە پرۆسەی ئیجتیهاددا پێویستە سوود لە ئەزموونی سەرکەوتووی مرۆڤایەتی وەربگیرێت، لەم رووەوە ڕێگا بە دەمارگیریو خورافاتو داخران نادات.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك دەکەوێتە ژێر کاریگەریی قوتابخانەی ئیسلاحی جەمالەدینی ئەفغانیو شێخ محەممەد عەبدە؟ ئەدەبیاتی ئەو قوتابخانەیە چ کاریگەرییەکی لەسەر شێخی خاڵ هەبووە؟**

د. سەباح بەرزنجی: پێموایە شێخی خاڵ، زانای رۆژگاری خۆی بووەو ئاگاداری بزاڤی رۆشنگەریی سەردەمی خۆی بووە، کەوتووشەتە ژێر کاریگەرییانەوە، لەهەمانکاتدا پارێزگاریی لە تایبەتمەندیی نەتەوەییو هزریی خۆی کردووە.

ئەمە بە ڕوونی لە تەفسیر و نووسینەکانیدا بەرچاو دەکەوێت.

**د. ئاراس: ئایا بیره نوێخوازەکەی شێخی خاڵ کاردانەوەو ڕەنگدانەوەی لەسەر مەلاو ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان هەبووە؟**

د. سەباح بەرزنجی: بیری شێخی خاڵ کاریگەریی لەسەر زانا گەنجەکانی کوردستان هەبووە، بۆ نموونە شێخی پاڕەزانیو مامۆستای شارەزووریو زۆرێك لەو مامۆستایانەی لە حەفتا و هەشتاکاندا ڕۆڵی بانگەوازیان دەبینی، بە جۆرێك لە جۆرەکان پەیوەست بوون بە بیروبۆچوونی مەدرەسەی خاڵەوە، بۆ خۆیشی موتابەعەی خوتبەو وەعزی زانا ئایینییەکانی دەکرد.

**د. ئاراس: شێخی خاڵ تا چ ئاستێك لە نوێبوونەوەی گوتاری ئایینی کاریگەری هەبووە؟**

د. سەباح بەرزنجی: لێرەدا تەنها ئاماژە بە بەرهەمێکی شێخ دەکەم، کە ئەویش (مەولوودنامەی نەوئەسەر)ە، لەم پەڕاوەدا شێخ ویستوویەتی بۆنەکانی لەدایکبوونی پێغەمبەری خودا (درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت)، لەو وتارە خورافیو دوور لە واقیعانە ڕزگار بکات کە سەردەمانێك، ئاڕاستەی خەڵکی کوردستان دەکرا.

کەواتە شێخی خاڵ زۆر مەبەستی بووە وتاری ئایینی هاوشانی سەردەم گۆڕانکاریی تێدا بکرێتو زیاتر موخاتەبەی بیر و هۆشی خەڵك بکات، نەك سۆز و عاتیفەیان.

**د. ئاراس: ئایا هەوڵی نوێکردنەوەی ئایینی زەرورەتێکی ئەو کاتو سەردەمە بووە، یان زیاتر لە ژێر کاریگەریی دەرەکییدا ئەو هەوڵانە دەرکەوتوون؟**

د. سەباح بەرزنجی: بێگومان شێخ کەسێکی وریا و شارەزا و ئاگاداری سەردەم بووە، لە هەمانکاتدا کوردستانو عێراقیش بەو شێوەیە دانەبڕاوە لە

پارچەکانی دیکەی جیهانی ئیسلام، کە یاساکانی کارلێکەری نەیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، هەر بۆیە هەوڵی نوێکردنەوە لە لایەکەوە زەروورەتی هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان بووە، لەلایەکی دیکەشەوە، پەیوەست بووە بە کۆی بارودۆخی جیهانی ئیسلامییەوە.

**د. ئاراس: دیارترین کۆسپەکانی بەردەم پڕۆژەی نوێخوازیو ئیسلاحیی شێخی خالْ چی بوون؟**

د. سەباح بەرزنجی: هەر پڕۆژەیەکی ریفۆرم کۆسپو تەگەرەی بۆ دروست دەبێت، لە هەموو چاخو دەورانێکدا، کە دیارترینیان کەسانی دۆگما و تەقلیدیو ئەوانەن کە دەقیان بە بیروبۆچوونی پێشترەوە گرتووە، لەم رووەوە بێگومان تێگەیشتنی تەقلیدیی زۆرێك لە مامۆستایانی مزگەوت کۆسپ بوون لەبەردەم بیرو هزری ریفۆرمخوازیی شێخی خالدا.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خالْ دەڵێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٢ دانەیەکی گۆڤاری (العروة الوثقى)م دەستکەوتو خوێندمەوە، پەردە لەسەرچاو و دڵم لاچوو، لەبارێکەوە کەوتمە بارێکی دیکە"، ئایا پڕۆگرامی حوجرە ئەوەندە بیری مرۆڤ ناکاتەوە کە گۆڤارێك دەیکاتەوە؟**

د. سەباح بەرزنجی: نەك حوجرە، تەنانەت زانکۆش ئەگەر لە ئاسۆیەکی داخراودا کار بکات، دەبێتە کۆسپێك بۆ مەعریفەو بیری نوێخوازی، دیارە لەو سەردەمەدا شێخ پێویستی بە بروسکەیەك هەبووە بۆ وریابوونەوەو بەخۆداهاتنەوە، کە ئەوەش لە (العروة الوثقى)دا بەرجەستە بووە.

**د. ئاراس: شێخ محەممەدی خالْ دەڵێت: "لە ژێر کاریگەریی نووسینو بۆچوونەکانی جەمالەددینی ئەفغانیدا کەوتمە بیری دانانی**

**فەرهەنگ‌و گرنگییدان بە زمانی کوردی"، بۆچی خوێندن‌و ژینگەی حوجرە ئەو کاریگەرییەی نەبووە؟**

د. سەباح بەرزنجی: ئیهتماماتی حوجرە لەو سەردەمەدا بریتی بووە لە گرنگییدان بە هەندێك زانست‌و مەتن‌و شەرح‌و حاشیە و وردەکاریی، کەمتر روویان لە پێداویستی رۆژانەی خەڵك کردووە، بۆیە پێویستبوو زانایەکی وەك ئەفغانی‌و عەبدە رچەشکێنی بکەن بۆ خەڵکانی هاوچەرخی خۆیان‌و دوای خۆیان کە روو بکەنە کاروباری کۆمەڵایەتی‌و زماننناسی‌و رەوانبێژی‌و داهێنان، کە دیارە نووسینی فەرهەنگیش دەکەوێتە ئەو بوارانەوە.

**د. ئاراس: بۆچی هەریەك لە مەلای گەورەی کۆیەو شێخ محەممەدی خاڵ نەیانتوانی لە سەردەمی خۆیاندا وەك نوێخوازێکی ئایینی دەربکەون؟**

د. سەباح بەرزنجی: لەبەر ئەوەی کۆمەڵی کوردەواری لە سەردەمی ئەواندا زیاتر سەرقاڵی بیری نەتەوەیی بووەو بیری ئایینی لە ریزبەندیی دوای بیری نەتەوەییدا خۆی بینیوەتەوە، بەتایبەت کە شۆڕشی رزگارییخوازی نەتەوەیی بوو بووە مانیفێستی کاری چینە خوێندەوارەکان، بە مامۆستایانی حوجرەشەوە، بۆیە لەو هەلومەرجەدا کەمتر بیری ریفۆرمی ئایینی هەژموونی بەسەر ساحەی فیکری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەوە دەبێت، جگە لە بوونی کۆسپ‌و تەگەرەی خەڵکانی تەقلیدی‌و شێخ و مەلای دژ بە ریفۆرم‌و نوێگەریی.

**د. ئاراس: بۆچی پرۆسەی پەروەردەو زانستی ئایینی لە کوردستاندا نەیتوانیوە خۆی نوێبکاتەوەو لەگەڵ گۆڕانەکانی سەردەمدا بچێتە پێشەوە؟**

د. سەباح بەرزنجی: هۆکاری زۆر هەیە بۆ وەستانی رەوتی زانستو پەروەردەی ئایینی، لەوانە:

١ـ بوونی دەسەڵاتی عەلمانی کە بووەتە هۆی بێنازبوونی مزگەوتو قوتابخانەو نێوەندە زانستییە ئایینییەکانو نارۆشنی داهاتووی هەموو ئەوانەی دەڕۆنە ئەو بوارەوە، لە ئەنجامدا هیچ پاڵنەریك نامێنێت بۆ خەڵك کە منداڵەکانیان بنێرنە خوێندنی ئایینی.

٢ـ هاتنی بیر و بۆچوونی نامۆ، کە بە هەموو شێوەیەك دژایەتی ئەم بوارە دەکەنو سووکایەتی بە رێبوارانی دەکەن.

٣ـ کەمتەرخەمیو بێهیممەتی زانا ئایینییەکان خۆیان.

**د. ئاراس: بەڕێزتان وەك دکتۆر سەباح بەرزنجی چۆن بەرهەمەکانو کەسێتی شێخی خاڵ هەڵدەسەنگێنن؟**

د.سەباح بەرزنجی: شێخی خاڵ زانا و بیرمەند و موفەسیرو زماننناسو ئەدیبێکی گەورە بووە، خزمەتی شایانی بە بیری ئیسلامییو نەتەوەی کورد کردووە، بەڵام دەکرا کار و بەرهەمی زیاتری هەبێت، کە ئەگەر مەشاغیلی رۆژانەو کاری قەزاوەتی لە ئەستۆ نەبا، کاریگەری زیاتری لەسەر کۆی رەوتی ئیسلامخوازی کوردستان دەبوو.

بەرهەمەکانی تائێستاش سەرچاوەن بۆ هۆگرانی زانستو مەعریفەو خۆیشی کەسایەتی پێشەنگو نموونەی زانای هاوچەرخو هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی بووە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی




سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ـ بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

- هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.